# ڕێگایەکی ئاسان

# بۆ جوان خوێندنەوەی قورئان

**ئەحکامەکانی تەجوید بەڕاهێنان**


**ئامادەکردنی**

**گۆران إبراهیم عبدالرحمن**

**پێداچوونەوەی**

**مامۆستا دارا جبار کریم**


--------------------------------


لەبڵاوکراوەکانی

**ماڵپەڕی بەهەشت**

**www.ba8.org**

islam_kurd_ba8@yahoo.com

07701517378

**عێراق - کوردستان - کەلار**

هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

**کتێبی ژمارە ﴿١٤٠﴾ لە کتێبخانەی ماڵپەڕی بەهەشت**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وكفى ، والصلاة والسلام على رسوله المصطفى ، وآله وصحبه المجتبى ، أما بعد :

بەڕاستی قورئانی پیرۆز ووزەی ڕۆحی ئیماندارانە ، و ئارامی دڵانە ، وە چۆن مرۆڤ بەبێ خواردن و خواردنەوە ناتوانێت بژێت هەروەها ئیمانداریش بەبێ قورئان خوێندنەوە دڵی لە لێواری مردن و داڕماندایە ، چونکە قورئان ووتەی خوای پەروەردگارە و هۆکاری پەیوەست بوونە بەخوای گەورە ، بۆیە یەکێك لەو هۆکارانە کە هانی ئیماندار دەدات بۆ ئەوەی زیاتر قورئان بخوێنێت ئەوەیە کە قورئان بە ( تجويد ) ەوە بخوێنێت ، چونکە چۆن فەرمانمان پێکراوە کە ئیش بەئایەتەکانی بکەین بەهەمان شێوە فەرمانمان پێکراوە کە بە ( تجويد ) ەوە بخوێنرێت ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا ﴾ ( المزمل : ٤ ) ، پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالب . خوای لێ ڕازی بێت . لە ڕاڤەکەیدا دەفەرموێت : ( ترتيل ) : مانای چاودێری کردنی وەستانەکان لە قورئان و جوان خوێندنەوەی پیتەکان . بۆیە هەر کەسێك توانای هەبێت پیتەکان بەجوانی بخوێنێتەوە و هەوڵ نەدات خوێندنەوەی چاك بکات ئەوا تاوانبار دەبێت لەلای سەرجەم ( قراء ) و زۆرێك لەزانایان .

وە ئەم کتێبە کە ناونیشانی ( **ڕێگایەکی ئاسان بۆ جوان خوێندنەوەی قورئان** ) کە ( م.گۆران ) ئامادەی کردووە ، هەولێکە لەم بوارەدا بۆ ئەوەی خوێنەری کورد بتوانێت حوکمەکانی تجويد فێرببێت بەشێوەی تیۆری ( نظري ) ئەگەرچی ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەبێ مامۆستا دەتوانێت قورئان فێرببێت ، چونکە ئەم قورئانە پێغەمبەرمان ﷺ بەزارەکی لە ( جبريل )ی وەرگرتووە ، و بەو شێوەش پێمان گەیشتووە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى الْقُرْآنَ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴾ ( النمل : ٦ ) .

ئینجا بەڕێز ( م.گۆران ) داوای لێکردم پێداچوونەوە بەم کتێبەدا بکەم منیش پێداچوومەوە و بینیم ( حسب علمي القاصر ) بەپێی زانیارییە کەمەکەم کتێبێکی بەسوودە لەم بوارەدا ، جا داواکارم لە خوای گەورە سوود بەخش بێت ، و پاداشتی ئامادەکار بداتەوە ، ئیتر هەر هەڵەیەك هەبێت لە ئێمە و شەیتانە ڕاستەکانیش لەخواوەیە . وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا وشفيعنا محمد وآله وصحبه وسلم .

**مجاز بقراءة الإمام عاصم : مامۆستا دارا جبار كريم**

**١٣ / محرم / ١٤٣٢ ك — ١٩/ ١٢ / ٢٠١٠ ز**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پێشەکی ئامادەکار

إنَّ الحَمْـــدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُــوْذُ بِالله مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْــدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَــهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَــهُ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَــهَ إِلاّ اللهُ وَحْــدَهُ لا شَــرِيْكَ لَــــهُ ، وَأَشْــهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ ... أَمَّا بَعْدُ :

بێگومـان خـەریك بـوون بـە قورئـانی پـیرۆز ، بـە خوێنـدن و لەبـەرکردن و تێگەیشتن لێـی و کارپێکردنی پاداشتێکی گەورەی هەیە لای خوای گەورە ، هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : " خيركم من تعلم القرآن وعلمه " ( رواه البخاري ) ، واتە : باشترینتان ئەو کەسەیە کە فێـری قورئـان ببێت و کەسـانی تـریش فێربکات ، بۆیـە منـیش هەسـتام بـە ئامـادەکرنی ئـەم پەرتووکـە بچوکە بۆ زیـاتر بەرچاو ڕۆشنی موسڵمانان بۆ جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز .

جا خوێنەری قورئان دۆست : ئەم پەرتوکەی بەردەستت بنـەوای کتێبـی ( مذكرة في التجويد ) ـە لە نووسنی ( محمد نبهان حسن ) بە هەندێ دەستکاری و کەم کـردن و زیـادکردن ئامـادەم کـردووە ، و سودم لـە هەندێك سەرچاوەی تر وەرگرتووە لەم کارەمدا لەوانـەش کتێبـی ( الملخص المفيـــد في علــم التجويد ) لە نووسینی ( محمد أحمد معبد ) ، و کتێبـی ( التسهيل في تجويد التتريل ) لـە نـووسینی ( أحمــد خورشيد رؤوف ) ، و کتێبی ( زانستی باش خوێندنەوەی قورئان ) لـە نووسینی ( م . دلێر خالد حسن ) ، هەروەها سوودم وەرگرتووە لەو زانیاریانەی کە لـەکـاتی دەرس خوێندم لای مامۆستای بـەڕێزم ( م. دارا جبـــــار ) کـە هانـدەرێکی باشـم بـوو بـۆ ئامـادەکردنی ئـەم پەرتوکـە ، وە ئـەرکی پێداچونەوەشی گرتە ئەستۆ .

لەم نووسینەدا زۆرێك لە زاراوەکانی زانستی تەجوید وەرگێڕاوە بـۆ سـەر زمـانی کـوردی بـەڵام هەندێ لە زاراوەم بەعەرەبی هێشتۆتەوە بۆ نموونە زاراوەی ( ضمة ) کە واتـا کوردییەکـەی ( بۆرە ) یە لە بڕگەکاندا هەر بە زمانی عەرەبی هێشتۆتەوە . لـە کۆتاییدا داواکارم لە پـەروەردگار یارمـەتی دەرمـان بێـت بـۆ خوێنـدنی قورئـان و کـارپێکردنی وە ببێتـە مایـەی ڕەزامەنـدی خـوای پـەروەردگار پاشان سوود گەیاندن بە موسوڵمانان بۆ جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز .

**گۆران إبراهيم عبدالرحمن**

١٣ / **شعبان** / ١٤٣١ك ــ ٢٥ / ٧ / ٢٠١٠

## گەورەیی و پاداشتی فێربوونی قورئان و فێرکردنی

١ ـ سەروەرمان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " خيركم من تعلم القرآن وعلمه " ( رواه البخاري ) ، واتە : باشترینتان ئەو کەسەیە کە فێری قورئان ببێت وکەسانی تریش فێربکات .

٢ ـ وە لە فەرموودەیەکی تریدا ﷺ فەرموویەتی : " ما اجتمع قومٌ في بيتٍ من بيوت الله ــ تعالى ــ يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة ، وحفتهم الملائكة ، وذكــرهم الله فيمن عنــده " ( رواه مــسلم ) ، واتە : هەر کۆمەڵێك کۆببنەوە لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا و قورئان بخوێننەوە و بە یەکتری بڵێنەوە ، ئیللا ئارامییان بەسەر دا دادەبەزێت ، و ڕەحمەت دایاندەپۆشێت ، و فریشتەکان دەوریان دەدەن ، و خوای گەورش لای فریشتەکان باسیان دەکات .

٣ ـ وە هانی موسڵمانانی داوە بۆ قورئان خوێندن و فەرموویەتی : " اقرءوا القرآن ؛ فإنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه " . ( رواه مسلم ) ، واتە : قوئان بخوێنن چونکە لە ڕۆژی دوایی دا تکاکارە بۆ خاوەنەکەی .

٤ ـ هەر سەبارەت بە پاداشتی قورئان ﷺ فەرموویەتی : " من قرأ حرفا من كتاب الله فله حــسنة ، والحسنة بعشر أمثالها لا أقول : ﴿ الــم ﴾ حــرف ، ولكن : ألف حرفــا ، ولام حرفــا ، ومــيم حرفــا " ( صحيح الجامع الصغير برقم : ٦٤٦٩ ) ، واتە : هەر کەسێك پیتێك لە قورئانی پیرۆز بخوێنێت ، بەهەموو پیتێکی چاکەیەکی بۆ دەنووسرێت ، چاکەی لای خـوای پـەروەردگار بە دە ئـەوەندەی خۆیـەتی و چەند جار دەکرێتەوە ، ناڵێم : ﴿ الــم ﴾ بە پیتێك دەژمێرێت ، بەڵکو ( ألف ) بە تـەنها پیتێکە و ( لام ) یش پیتێکە و ( میم ) یش پیتێکە .

٥ ـ وە سەبارەت بە قورئان خوێنان ﷺ فەرموویەتی : " الماهر بالقرآن مع السفرة الكــرام الــبررة والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران " ( متفق عليه ) ، واتە: ئەوەی قورئان بە دروستی و جوانی دەخوێنێتـەوە ئەوە لەگەڵ فریشتە بەرێزەکانی خوادایـە ، ئـەو فریشتانەی کـە سـەفیرن لـە نێوان خوای گەورە وبەندەکانی ، وئەوەی قورئان دەخوێنێت ودەوەستێت و تیایدا وقورسە لەسەر زمانی ئەو کەسە دوو پاداشتی هەیە .

## مانای چەند ووشەیەك

| | |
|---|---|
| كلمة | ووشه |
| حرف | پیت |
| فتحة | سەره |
| كسرة | ژێره |
| ضمة | بۆره |
| سكون | زەننه |
| غنة | مینگه |
| متحرك | بزواو |
| حركة | درێژی یەك ئەلیف یان ٢ چركه |



## هەندێك هەڵەكردن بەهۆی وێنە

لە خوێندنەوەی هەندێك ووشە لە قورئاندا هەڵە دەكرێت بەهۆی وێنەی ( مصحف ) كە وێنەی ئەلف دەكرێت لەسەر واو یان سكون دەكرێت لەسەر یاء ... هتد .

١- ﴿ ٱلۡحَيَوٰة ﴾ ﴿ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ ﴿ ٱلصَّلَوٰة ﴾ ﴿ ٱلرِّبَوٰا ﴾ .

٢- ﴿ يَلۡوُۥن ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ يَلْوُونَ ﴾ .

٣- ﴿ تَلۡوُۥٓا ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ تَلْوُوا ﴾ .

٤- ﴿ أَكَـٰبِر ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ أَكَابِرَ ﴾ .

٥- ﴿ وُۥرِى ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ وُورِيَ ﴾ .

٦- ﴿ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ ومَلَـــئِــهِ ﴾ .

٧- ﴿ إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ إِنَّ وَلِــيِّـــيَ اللهُ ﴾ .

٨- ﴿ نُـۨجِى ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ نُــنْــجِي ﴾ .

٩- ﴿ وَجِاْىٓءَ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ وَجِيءَ ﴾ .

١٠- ﴿ بِأَيْيْد ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ بِــأَيْــدٍ ﴾ .

١١- ﴿ ٱلۡمَسَـٰجِد ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ الْمَسَاجِدِ ﴾ .

١٢- ﴿ بِٱلۡغَدَوٰة ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ بِالْغَدَاةِ ﴾ .

## تەجوید

**پێناسەی تەجوید :** واتە پێدانی ( **حق و مستحق** ) ی هەموو پیتێك لە مەخرەج و سیفات و مەدد و ... هتد .

**حق الحرف :** واتە دەرکردنی هەموو پیتێك لە شوێنی دەرچوونی خۆی وە ئەو سیفاتانەی کە پەیوەستە پێوەی وەکو همس و شدة و إستعلاء ... هتد .

**مستحق الحرف :** واتە پێدانی ئەو سیفاتانەی کە تووشی دەبێت وەکو قورس و سووك کردن ( **تفخیم و ترقیق** ) .

**مەبەستی :** واتە پاراستنی زمان لە هەڵەکردن لە کاتی قورئان خوێندندا .

**حوکمەکەی :** فێربوونی فەرزی کیفایەیە ، بەڵام کردەوە ( عمل ) پێکردنی فەرزی عەینە .

## أحكام الإستعاذة والبسملة

### حوکمەکانی پەناگرتن و ناوی خواهێنان

### یەکەم : پەناگرتن ( الإستعاذة ) :

لەکاتی دەست پێکردنی قورئان خوێندندا لە سەرەتای سوورەت بێت یان ناوەڕاست پێویستە چونکە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ ( النحل : ٩٨ ) ، واتە : هەر کە ویستت قورئان بخوێنیت پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو . .

### دووەم : ناوی خواهێنان ( البسملة ) :

سوننەتێکی موئەکەدەیە لە سەرەتای هەموو سورەتێك لە سورەتەکانی قورئان جگە لە سەرەتای سورەتی ( التوبة ) نەبێت .

## شێوازەکانی ( الإستعاذة و البسملة )

**چوار شێوازی هەیە :**

**١ ـ گەیاندنی هەمووی ( وصل الجميع ) :**

واتە گەیاندنی هەموویان بەیەکەوە ﴿ أَعُــوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ و ﴿ بِسْمِ اللّـــهِ الــرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ و سورەتەکە بەیەکەوە بەبێ وەستان لە نێوانیان .

بەم شێوەیە : ﴿ أَعُــوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الــرَّجِيمِ بِسْمِ اللّهِ الــرَّحْمَنِ الــرَّحِيمِ قُـــلْ هُـــوَ اللَّـــهُ أَحَــدٌ ﴾ .

**٢ ـ جیاکردنەوەی هەمووی ( قطع الجميع ) :**

واتە وەستان لەسەر ﴿ أَعُــوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الــرَّجِيمِ ﴾ ، پاشان وەستان لەسەر ﴿ بِسْمِ اللّـــهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ، پاشان سورەتەکە دەست پێ دەکەین .

بەم شێوەیە : ﴿ أَعُوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ ﴿ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾.

**٣ ـ گەیاندن ( وصل ) ی** ﴿ أَعُوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ و ﴿ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الــرَّحِيمِ ﴾ بەیەك هەناسە ، و سەرەتای سورەتەکە بە هەناسەیەکی تر .

بەم شێوەیە : ﴿ أَعُــوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ .

**٤ ـ جیاکردنەوە ( قطع ) ی** ﴿ أَعُوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ بەهەناسەیەك ، و گەیاندنی ﴿ بِــسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ و سورەتەکە بەیەك هەناسە .

بەم شێوەیە : ﴿ أَعُــوذُ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الــرَّجِيمِ ﴾ ﴿ بِسْمِ اللّهِ الــرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ قُــلْ هُــوَ اللَّــهُ أَحَــدٌ ﴾ .

## شێوازەکانی ( البسملة ) له نێوان سورەتەکان

چوار شێوازی هەیە :

١ ـ سیانیان ڕێپێدراوە ( الأوجه الجائزة ) :

٢ ـ یەکێکیان ڕێپێنەدراوە ( وجه غیر جائز ) :

## ڕووه ڕێپێدراوەکان ( الأوجه الجائزة )

**أ ـ گەیاندنی هەمووی ( وصل الجمیع ) :**

واتە گەیاندنی کۆتایی سورەتی یەکەم و ﴿ بِسْمِ اللّهِ الـرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ ﴾ و سەرەتای سورەتی دووەم بەیەك هەناسە ، بەم شێوەیە :

﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ .

**ب ـ جیاکردنەوەی هەمووی ( قطع الجمیع ) :**

واتە وەستان لەسەر کۆتایی سورەتی یەکەم و پاشان وەستان لەسەر ﴿ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ پاشان دەست پێکردنی بە سەرەتای سورەتی دووەم .

بەم شێوەیە : ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ ﴿ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ .

**ج ـ جیاکردنەوەی** کۆتایی سورەتی یەکەم و گەیاندنی ﴿ بِسْمِ اللّهِ الـرَّحْمَنِ الـرَّحِيمِ ﴾ و سەرەتای سورەتی دووەم بەیەك هەناسە .

بەم شێوەیە : ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ ﴿ بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ .

## ڕووە ڕێپێنەدراوەکان ( الأوجه غير الجائزة )

واتە کۆتـایی سـورەتی یەکەم و ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ بەیەك هـەنـاسە بخوێنرێتەوە ، و سـەرەتای سـورەتی دووەم بـە هـەنـاسـەیـەکی تر بخوێنرێتەوە ، ئەوەش بەم شێوەیە : ﴿ وَمِــن شَرِّ حَــاسِدٍ إِذَا حَسَدَ بِسْمِ اللَّهِ الــرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ﴿ قُلْ أَعُــوذُ بِرَبِّ النَّــاسِ ﴾ .

## چۆنێتی گەیاندنی سوورەتی ( الأنفال ) بە ( التوبة )

ئەگـەر لـە سـەرەتادا دەسـتت کـرد بـە خوێندنـەوەی سـورەتی ( التوبـة ) ئـەوا تـەنها ( الإسـتعاذة ) دەخـوێنی ، بـەڵام ئەگـەر سـورەتی ( الأنفـال )ت خوێنـد و تـەواوت کـرد وە وویـستت ڕاسـتەخۆ سورەتی ( التوبة )ش بخوێنی ئەوا سێ شێوازی هەیە .

١- وەستان بەهەناسەدانەوە بەم شێوەیە :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌ ﴾ ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ﴾ .

٢- گەیاندنی کۆتـای سورەتی ( الأنفال ) بەسـەرەتای سـورەتی ( التوبـة ) بـەبێ هەناسـەدان و بەبێ سەکتە بەم شێوە :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ﴾ .

٣- سەکتەکردن بەبێ هەناسەدان بەم شێوەیە :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌ ۜ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ﴾ .

# أحكام النون الساكنة و التنوين

## حوکمەکانی نوونی زەنندار و تەنوین

واتە : کاتێك ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) بگەن بە ( ٢٨ ) پیتەکەی زمــانــی عــەرەبی .

✍ مەبەستمان لە نوونی ساکن ئەو نوونەیە کە سکونی لەسەر بێت .

وەکو : ( منْ ، عنْ ، لنْ ، إنْ ، أنْ ) .

✍ مەبەستمان لە تەنوین واتە دوو ( فتحة ، ضمة ، کسرة ) ـەیە ، کە خۆیان لـە خۆیاندا دەبن بە نوونی ساکن ، وەکو :

﴿ جَنَّاتٌ ﴾ ــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ جَنَّاتُنْ ﴾ .

﴿ عُرُبــًا ﴾ ــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ عُــرُبَنْ ﴾ .

## چوار حکم هەیە لە نوونی ساکن و تەنوین

١ـ الإظهار ⟵ ٦ پیت .

٢ـ الإدغام ⟵ ٦ پیت .

٣ـ الإقلاب ⟵ ١ پیت .

٤ـ الإخفاء ⟵ ١٥ پیت .

## یەکەم : ئاشکراکردن ( الإظهار )

واتە خوێندنەوە و دەرخستنی ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) وەکو خۆیان ، کاتێك بگەن بەم شەش پیتە ( ء ، ه ، ع ، ح ، غ ، خ ) ، کە لەسەرەتای ئەم ووشانە کۆکراونەتەوە :

( أَخي هَاك علماً حَازَهُ غَيرُ خَاسرِ ) .

| | | |
|---|---|---|
| نْ<br>ـً<br>ـٌ<br>ـٍ | ← | ء<br>هـ<br>ع<br>ح<br>خ<br>غ |

**نموونە لەسەر پیتەکانی ( الإظهار ) :**

| ژ | پیتەکانی الإظهار | | نموونە لەیەك ووشە | نموونە لەدوو ووشە | نموونە لە تەنوین |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | الهمزة | ء | يَنْئَوْنَ | مَنْ آمَنَ | كُلٌ آمَنَ |
| ٢ | الهاء | ه | الأَنْهَارُ | مِنْ هَادٍ | جُرُفٍ هَارٍ |
| ٣ | العين | ع | أنْعَمتَ | مِنْ عِلْمٍ | حَكيمٍ عَليم |
| ٤ | الحاء | ح | يَنْحِتُونَ | تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ | منْ حَكيمٍ حَميدٍ |
| ٥ | الغين | غ | فَسيُنْغِضُونَ | مِنْ غِلّ | قَوْلاً غَيْرَ |
| ٦ | الخاء | خ | وَالْمُنْخَنِقَةُ | مِنْ خَيْرٍ | عَليمٌ خَبيرٌ |

**تێبینی :** بەم ( إظهـــار ) ـە دەوترێت ( الإظهار الحلقي ) ، چونکە هەر شەش پیتەکەی ( إظهار ) لە قوڕگ ( حلق ) ـەوە دەردەچێت .

## ڕاهێنان و شیکارەکەی

**پرسیار** : **خوای گەورە دەفەرموویێت** : ﴿ قَالَ أَتَعۡبُدُونَ مَا تَنۡحِتُونَ ﴾ ﴿ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُكُمۡۚ ﴾ ﴿ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴾ .

**وولاّم** :

**یەکەم** : **لە ووشەی ﴿ تَنۡحِتُونَ ﴾ لە دوای نوونی ساکن پیتی ( الحاء ) هاتووە ، وە پیتی ( الحاء ) یەکێکە لەپیتەکانی ( الإظهار ) کەواتە حوکمی نوونی ساکن ( الإظهار )ـە .**

**دووەم** : **لەهەر دوو ووشەی ﴿ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ ﴾ کۆتای ووشەی یەکەم تەنوینە ، وە لەسەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( همزة ) هاتووە ، وە پیتی ( همزة ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإظهار ) کەواتە حوکمی تەنوینەکە ( الإظهار )ـە .**

**سێیەم** : **لە هەر دوو ووشەی ﴿ وَلِمَنۡ خَافَ ﴾ نوونی ساکن کەوتۆتە کۆتای ووشەی یەکەم ، وە پیتی ( الخاء ) کەوتۆتە سەرەتای ووشەی دووەم ، وە پیتی ( الخاء ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإظهار ) کەواتە حوکمی تەنوینەکە ( الإظهار )ـە .**

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار** : **لەم ئایەتانەی خوارەوە حوکمی ( الإظهار ) دیاری بکە .**

﴿ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّـٰتُ عَدۡنٍ تَجۡرِى مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ﴾ ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ ﴿ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۖ فَمَنۡ ءَامَنَ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ .

**پرسیار** : **پیتەکانی ( الإظهار ) بژمێرە ؟**

**وولاّم** : ________________________ .

## دووەم : تێهەڵکێشان ( الإدغام )

واتە تێهەڵکێشانی کۆتایی ووشەیەك بەسەرەتای ووشەیەکی تر کە لە پاش ئەوەوە دێت ، ئەمیش کاتێك دەبێت لە دوای ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) ـەوە پیتەکانی إدغام بێت کە ( ي ، ر ، م ، ل ، و ، ن ) ـە ، کۆکراونەتەوە لە ووشەی ( يرملون ) .

نْ
ـً
ـٌ
ـٍ

←

ي
ر
م
ل
و
ن

کە ووشەی ( يرملون ) یان پێکهێناوە .

لەم کاتەدا ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) لادەدەین و شەددەیەك ( ـّ ) دەخەینە سەر پیتەکەی دوای خۆی کە یەکێکە لە پیتەکانی ( يرملون ) ـە ، جگە لە هەر دوو پیتی ( و ، ی ) .

**إدغام دەبێت بە سێ بەش ئەوانیش :**

**١ . تێهەڵکێشانی تەواوی مینگەدار ( الإدغام الكامل بغنة ) :**

**٢ . تێهەڵکێشانی ناتەواوی مینگەدار ( الإدغام الناقص بغنة ) :**

**٣ . تێهەڵکێشانی تەواوی بێ مینگە ( الإدغام الكامل بلا غنة ) :**

## یەکەم : تێهەڵکێشانی تەواوی مینگەدار ( الإدغام الكامل بغنة )

ئەو تێهەڵکێشکردن ( إدغام ) ـەیە ڕوودەدات کاتێك کە ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) بگەن بە هەردوو پیتی ( م ، ن ) ، لەم کاتەدا مینگە ( غنة ) ی تەواوی پێدەدەین .

**نموونە :**

| ژ | پیتەکانی الإدغام | لەگەڵ نون | لەگەڵ تەنوین |
|---|---|---|---|
| ١ | ن النون | مِن نِّعْمَةٍ | يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ |
| ٢ | م الميم | مِن مَّالِ اللَّه | لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا |

﴿ مِن نِّعْمَةٍ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ مِنِّعْمَةٍ ﴾ .
﴿ مِّن مَّالِ اللَّه ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ مِمَّالِ اللَّه ﴾ .
﴿ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴾ ـــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ يَوْمَئِذِ نَّاعِمَةٌ ﴾ .

﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴾
﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ ﴿ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴾ .

## دووەم : تێهەڵکێشانی ناتەواوی مینگەدار ( الإدغام الناقص بغنة )

ئەو تێهەڵکێشکردن ( إدغام ) ەیە ڕوودەدات کاتێك کە ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) بگەن بە هەردوو پیتی ( و ، ی ) ، لەم کاتەدا خودی پیتەکە کە ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) ە نامێنێت ، بەڵام سیفەتەکەی کە مینگە ( غنة ) یە دەمێنێتەوە .

**نموونە :**

| ژ | پیتەکانی الإدغام | لەگەڵ نون | لەگەڵ تەنوین |
|---|---|---|---|
| ١ | ي الياء | مَن يَقُولُ | بَرْقٌ يَجْعَلُونَ |
| ٢ | و الواو | مِن وَالٍ | وَلِكُلٍ وِجْهَةٌ |

﴿ مَن يَقُولُ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ مَيَقُولُ ﴾.
﴿ مِن وَالٍ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ مِوَالٍ ﴾.

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴾ ﴿ لَّهُمۡ عَذَابٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَقُّۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ﴾ .

## سێ یەم : تێهەڵکێشانی تەواوی بێ مینگە ( الإدغام الكامل بلا غنة )

بریتییە لە بەیەککەیشتنی ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) لەگەڵ هەر دوو پیتی ( ل ، ر ) لێرەدا مینگە ( غنة ) دروست نابێت ، چونکە نونەکە نەخۆی و نە سیفەتەکەی کە مینگە ( غنة ) یە نامێنێت .

**نموونە :**

| ژ | پیتەکانی الإدغام | لەگەڵ نون | لەگەڵ تەنوین |
|---|---|---|---|
| ١ | ل اللام | مِن لَّدُنْهُ | وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ |
| ٢ | ر الراء | مِن رَّبِّهِمْ | مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ |

﴿ مِن لَّدُنْهُ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ مِلَّدُنْهُ ﴾ .

﴿ مِن رَّبِّهِمْ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ مِرَّبِّهِمْ ﴾ .

﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾

﴿ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾

**تێبینی :** إدغام لە یەك ووشە روونادات ، بەڵکو لە دوو ووشە ڕوودەدات ، وە ئەگەر لە یەك ووشە بوو ئەوا إظهار دەکرێت ، و پێشی دەوترێت ( الإظهار المطلق ) .

وەکو :

( قِنْوَانٌ ، صِنْوَانٌ ، الدُّنْيَا ، بُنْيَان ) .

کە تەنها ئەم چوار ووشە لە قورئاندا هەن .

## ڕاهێنان و شیکارەکەی

**پرسیار** : **خوای گەورە دەفەرموویێت** : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْأَخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُواْ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَـٰتِلُواْ قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَـٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَـٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ﴾ ﴿ ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَـٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلاً ﴾ .

**وولاّم :**

**یەکەم : لە ئایەتی یەکەمدا هیچ حوکمی ( الإدغام )ی تێدا نیە .**

**دووەم : لە ئایەتی دووەمدا لە هەردوو ووشەی ﴿ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ﴾ لە ووشەی یەکەمدا تەنوین هاتووە ، وە لە ووشەی دووەمدا پیتی ( اللام ) هاتووە ، وەپیتی ( اللام ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإدغام ) ، کەواتە حوکمی ( الإدغام الکامل بلا بغنة )یە ، وە لە هەمان ئایەتدا لە هەر دوو ووشەی ﴿ مَلِكًا نُّقَـٰتِلْ ﴾ لە ووشەی یەکەمدا تەنوین هاتووە ، وە لە ووشەی دووەمدا پیتی ( النون ) هاتووە ، وەپیتی ( النون ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإدغام ) ، کەواتە حوکمی تەنووینەکە ( الإدغام الکامل بغنة )یە .**

**سێیەم : لە ئایەتی سێیەمدا لە هەر دوو ووشەی ﴿ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾ لەدوای تەنوین پیتی ( المیم ) هاتووە ، وە پیتی ( المیم ) یەکێکە لە پیتەکانی ( إدغام ) کەواتە حوکمی تەنووینەکە ( الإدغام الکامل بغنة )ـە ، وە هەروەها لە هەمان ئایەتدا لە هەر دوو ووشەی ﴿ مَّكَانًا وَأَضَلُّ ﴾ لەدوای تەنوین پیتی ( الواو ) هاتووە ، وە پیتی ( الواو ) یەکێکە لە پیتەکانی ( إدغام ) کەواتە حوکمی تەنووینەکە ( الإدغام الناقص بغنة )ـە .**

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار** : **لەم ئایەتانەی خوارەوە حوکمەکانی ( الإدغام ) دیاری بکە .**

**خوای گەورە دەفەرموویێت** : ﴿ لَّقَدْ كَانَ فِى يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَـٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴾ ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴾ ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى لَشَدِيدٌ ۝٧ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓاْ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾

﴿ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّـٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَـٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ .

**پرسیار : بۆچی بەهەر دوو پیتی ( و ، ی ) دەووترێت ( الإدغام الناقص بغنة ) ؟**

**وولاّم :** ______________________ .

## سێیەم : هەڵگەڕاندنەوە ( الإقلاب )

**واتە هەڵگەڕانەوەی ( نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ ) بۆ میمێکی ساکنی مینگەدار ( غنة ) ، کاتێك بگەن بە پیتی ( ب ) بەلاّم ( ب ) ـەکە وەکو خۆی دەخوێنرێتەوە ، و هەر دوو لێو بە تەواوی دەبەستین .**

| نْ ، ـً ، ـٌ ، ـٍ | + | ب | ← | هەڵگەڕاندنەوە ( الإقلاب ) |
|---|---|---|---|---|

**نموونە :**

| پیتی الإقلاب | لەیەك ووشە | لەدوو ووشە | لە تەنوین |
|---|---|---|---|
| ب | أَنبِئْهُم | أن بُورِك | إنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ |

﴿ مِن بَعْدِ ﴾ ـــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ مِمْبَعْدِ ﴾ .
﴿ عَلِيمٌ بِذَاتِ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ عَلِيمُمْبِذَاتِ ﴾ .
﴿ أَن بُورِك ﴾ ـــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ أَمْ بُورِك ﴾ .
﴿ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ ــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ سَمِيعُمْ بَصِيرٌ ﴾ .

﴿ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴾ ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾ .

## ڕاهێنان و شیکارەکەی

**پرسـیار :** **خـوای گـەورە دەفـەرموویێت :** ﴿ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ﴾ .

**وولاٌم :**

**یەکـەم :** **لـە هـەر دوو ووشـەی ﴿مِّنۢ بَعْدِ ﴾ کۆتـای ووشـەی یەکـەم نـوونی سـاکنە ، وە سـەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( الباء )ـە ، وە پیتی ( الباء ) تاکە پیتی ( الإقلاب )ـە ، کەواتە حوکمی نوونە ساکنەکە ( الإقلاب )ـە.**

**دووەم :** **لە ووشەی ﴿ ٱلْأَنۢبِيَآءَ ﴾ لەدوای نوونی ساکن پیتی ( الباء ) هاتووە ، وە پیتـی ( الباء ) تاکە پیتی ( الإقلاب )ـە کەواتە حوکمی نوونە ساکنەکە ( الإقلاب )ـە .**

## ڕاهێنان ئەرکی خوێندکار

**پرسیار :** **لەم ئایەتانەی خوارەوە حوکمی ( الإقلاب ) دیاری بکە ؟**

**خوای گەورە دەفەرموویێت** ﴿ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴾ ﴿ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَـٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ .

## چوارەم : شاردنەوە ( الإخفاء )

واتە شاردنەوەی ( نْ ، ـــً ، ـــٌ ، ـــٍ ) کاتێك بگەن بە ( ١٥ ) پیت جگە لە پیتەکانی ( إدغام ، و إظهار ، و إقلاب ) کە ( ١٣ ) پیتن لەم حاڵەتەدا مینگە ( غنة ) دەدەینە ( نْ ، ـــً ، ـــٌ ، ـــٍ ) ، وە ( إخفاء ) ئاشکرای ناکەین وەکو إظهار وە ناشی شارینەوە وەکو إدغام ، واتە لە نێوان هەر دووکیاندایە ، وە مینگە ( غنة ) بە پێی پیتەکەی دوای خۆی دەگۆڕێت ، واتە سووکی و قورسی مینگە ( غنة ) ـەکە .

✍ ژمارەی پیتەکانی ( ١٥ ) پیتن لە سەرەتای ووشەکانی ئەم دێڕە شعرەدا هاتوون :

صِفْ ذَا ثنا كَم جَادَ شَخْصٌ قَدْ سَمَا        دُمْ طَيِّباً زِدْ فِي تُقًى ضَعْ ظَالِما

**نموونە :**

| ژ | ووشە | پیتی الإخفاء | لەیەك ووشە | لە دوو ووشە | لە تەنوین |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | صف | ص | وَالأَنصَارِ | أَنْ صَدُّوكُمْ | رِيحاً صَرْصَرًا |
| ٢ | ذا | ذ | أَنذِرْهُمْ | مِن ذَهَبٍ | ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ |
| ٣ | ثنا | ث | الْأُنثَى | مِن ثَمَرَةٍ | قَوْلاً ثَقِيلًا |
| ٤ | كم | ك | الْمُنكَرِ | مَن كَانَ | كِتَابٌ كَرِيمٌ |
| ٥ | جاد | ج | فَأَنجَيْنَاكُمْ | إِن جَاءكُمْ | خَلْقٍ جَدِيدٍ |
| ٦ | شخص | ش | فَأَنشَرْنَا | إِن شَاء | إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ |
| ٧ | قد | ق | انقَلَبُواْ | مِن قَرَارٍ | إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ |
| ٨ | سما | س | الإِنسَانُ | مِن سُلَالَةٍ | وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ |
| ٩ | دم | د | أَندَادًا | مِن دَابَّةٍ | وَكَأْساً دِهَاقًا |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠ | طيبا | ط | بِقِنطَارٍ | مِّن طِينٍ | صَعِيداً طَيِّبًا |
| ١١ | زد | ز | تَنزِيلَ | مِن زَوَالٍ | صَعِيداً زَلَقًا |
| ١٢ | في | ف | فَانفَلَقَ | مِن فَضْلِهِ | خَالِداً فِيهَا |
| ١٤ | تقى | ت | وكُنتُمْ | وَمَن تَابَ | جَنَّاتٍ تَجْرِي |
| ١٤ | ضع | ض | مَّنضُودٍ | وَمَن ضَلَّ | وَكُلاً ضَرَبْنَا |
| ١٥ | ظالما | ظ | يُنظَرُونَ | مِّن ظَهِيرٍ | ظِلاً ظَلِيلاً |

﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌۖ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِيَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴾ ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۚ قَالُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾

## ڕاهێنان و شیکارەکەی

**پرسیار : خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ ﴿ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴾ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴾ .

**وەڵام :**

**یەکەم : لە ووشەی ﴿ عَنكَ ﴾ لە دوای نوونی ساکن پیتی ( الكاف ) هاتووە ، وە پیتی( الكاف ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإخفاء ) کەواتە حوکمی نوونەکە ( الإخفاء )ـە ، هەر لە هەمان ئایەت لە ووشەی ﴿ أَذِنتَ ﴾ لە دوای نوونی ساکن پیتی ( التاء ) هاتووە ، وە پیتی ( التاء ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإخفاء ) کەواتە حوکمی نوونەکە ( الإخفاء )ـە .**

**دووەم : لەئایەتی دووەم حوکمی ( الإخفاء )ی تێدا نیە .**

**سێیەم : لە ووشەی ﴿ أَنفُسَهُم ﴾ لە دوای نوونی ساکن پیتی ( الفاء ) ، وە پیتی ( الفاء ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإخفاء ) کەواتە حوکمی نوونەکە ( الإخفاء )ـە .**

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار : لەم ئایەتانەی خوارەوە حوکمی ( الإخفاء ) دیاری بکە .**

**خـوای گـەورە دەفـەرموویێت :** ﴿ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِىٓ أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمۡۖ إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ﴿ قَالُواْ تِلۡكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴾ ﴿ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ﴾ .

**پرسیار : پیتەکانی ( الإخفاء ) بەشعر بنووسە ؟**

**وولاٌم :** ______________________ .

## ڕاهێنانی گشتی لەسەر ( أحكام النون الساكنة و التنوين )

**پرسیار : لەم ئایەتانەی خوارەوە ( أحكام النون الساكنة و التنوين ) دیاری بکە .**

**خـوای گـەورە دەفـەرموویێت :** ﴿ يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٍ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٍ مُّحۡضَرًا وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدًاۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ ﴿ قَالَ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ ﴿ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأۡتِيهِ ٱلۡمَوۡتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴾ ﴿ هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِى رَبِّهِمۡۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتۡ لَهُمۡ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوۡقِ رُءُوسِهِمُ ٱلۡحَمِيمُ ﴾

**پرسیار : ئەگەر لە دوای نونی ساکن پیتی ( القاف ) هات چ حوکمێکی هەیە ؟**

**وولاٌم :** ______________________ .

**پرسیار : ئەگەر لە دوای نوونی ساکن پیتی ( عين ) چ حوکمێکی هەیە ؟**

**وولاٌم :** ______________________ .

**پرسیار : بۆچی بەهەر دوو پیتی ( ر ، ل ) دەووترێت ( الإدغام الكامل بلا غنة ) ؟**

**وولاٌم :** ______________________ .

**پرسیار : لە ووشەی ﴿ ٱلدُّنۡيَا ﴾ چ حوکمێکی هەیە ؟**

**وولاٌم :** ______________________ .

**پرسیار : جۆرەکانی ( الإدغام ) بژمێرە ؟**

**وولاٌم :** ______________________ .

# أحكام الميم والنون المشددتين

## حوکمەکانی میمی زەنندار و شەدەدار

ئەو نون و میمەی ( شدة ) ی لــە سەر بێت لــە کــاتی خــوێندنــەوەدا دوو چــرکە ( حرکة ) مینگە ( غنة ) کەی درێژ دەکەینەوە .

**نموونە :**

مَّ ⟵ ثُمَّ ، مِّن مَّسَدٍ ، وَمِمَّا ، مِن مَّاء .

نّ ⟵ النَّهَارِ ، النَّاسِ ، إِنَّ الله .

**خوای گەورە دەفەرموویێت :** ﴿ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًىۖ وَإِن يُقَـٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ .

**تێبینی :** لە کاتی وەستان ( وقف ) دا لەسەر ووشەیەك کە کۆتاییەکەی ( ن ، م ) ی شـەددە دار ( مشدد ) بێت دوو چرکە ( حرکة ) لەسەر مشددەکە دەوەستین .

# أحكام الميم الساكنة

## حوکمەکانی میمی زەنندار

سێ حوکم هەیە لە میمی زەنندار ( ساكن ) دا :

١ . تێهەڵکێشکردنی لێوی ( الإدغام الشفوي ) .

٢ . شاردنەوەی لێوی ( الإخفاء الشفوي ) .

٣ . ئاشکراکردنی لێوی ( الإظهار الشفوي ) .

لەبەر ئەوە پێدەوترێت شفوی چونکە لە ( شفة ) لێوەوە دەردەچێت .

## ١ ـ تێهەڵکێشکردنی لێوی ( الإدغام الشفوی )

واتە تێهەڵکێشانی ووشەیەك کە کۆتاییەکەی ( مْ ) بێت لەگەڵ ووشەیەك کە سەرەتاکەی میمێکی بزواو ( متحرك ) بێت ( مَ ، مُ ، مِ ) لەم کاتەدا ( مْ ) لادەدەین و ( شدة ) دەخەینە سەر میمە بزواو ( متحرك ) ـە کە بەم شێوەیە :

مْ + مَ / مُ / مِ ← مَّ / مُّ / مِّ

**نموونه :**

﴿ جَاءكُم مِّنَ ﴾ ــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــــ ﴿جَاءكُمِّنَ﴾ .

﴿ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ ﴾ ــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ وَلَكُمَا كَسَبْتُمْ ﴾ .

﴿ رَبَّهُم مِّن ﴾ ــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ رَبَّهُمِّن ﴾ .

﴿الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ ﴾ ــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ الَّذِي أَطْعَمَهُمِنْ ﴾ .

﴿ مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمۡ أُغۡرِقُواْ فَأُدۡخِلُواْ نَارٗا فَلَمۡ يَجِدُواْ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارٗا ﴾ ﴿ وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴾ ﴿ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَحۡسَنُ أَثَٰثٗا وَرِءۡيٗا ﴾ .

وە هەروەها پێشی دەوترێت ( الإدغام المتماثلين ) .

## ٢ ـ شاردنەوەی لێوی ( الإخفاء الشفوی )

واتە شاردنەوەی ( مْ ) کاتێك بگات بە پیتی ( ب ) بە شێوازێك کە مینگە ( غنة )ی پێبدرێت ، وە هەر دوو لێو بەیەکەوە دەبەستین ، و هیچ بۆشاییەك لە نێوان هەر دوو لێو نابێت .

مْ + ب

**نموونە :**

﴿ يَوْمَ هُمْ بَارِزُونَ ﴾ .

﴿ تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ ﴾ .

﴿ وَكَلْبُهُمْ بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ ﴾ .

﴿ إِنَّ رَبَّهُمْ بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَخَبِيرٌ ﴾ .

**خوای گەورە دەفەرمووێت :** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴾ ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ ﴿ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَىٰ ﴾ .

## ٣ ـ ئاشكراكردنی لێوی ( الإظهار الشفوی )

واته دەرخستنی ( مْ ) وەكو خۆی كاتێك له دوایەوە ( ٢٨ ) پیتەكەی زمانی عەرەبی بێت جگه له هەر دوو پیتی ( م ، ب ) بەبێ درێژكردنەوەی مینگه ( غنة ) .

مْ + ( ٢٨ ) پیت جگه له ( م ، ب )

**نموونه :**

أ ـ ﴿ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم ﴾ .
ت ـ ﴿ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ﴾ .
ث ـ ﴿ مِن دِيَارِكُمْ ثُمَّ ﴾ .
ج ـ ﴿إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾ .
ح ـ ﴿غَنِيمتُم حَلالا ﴾ .
خ ـ ﴿ تسئلُهُم خَرجا ﴾ .
د ـ ﴿ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ اللَّهُ ﴾ .
ذ ـ ﴿ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِك ﴾ .
ر ـ ﴿ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ .
ز ـ ﴿ أَمْ زَاغَتْ ﴾ .
س ـ ﴿ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُم ﴾ .
ش ـ ﴿ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا ﴾ .
ص ـ ﴿ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ ﴾ .
ض ـ ﴿ فِيكُمْ ضَعْفًا ﴾ .
ط ـ ﴿ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ ﴾ .
ظ ـ ﴿ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ ﴾ .
ع ـ ﴿ مِنكُمْ عِشْرُونَ ﴾ .
ف ـ ﴿ وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا ﴾ .
ق ـ ﴿ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ ﴾ .
ك ـ ﴿ أَمْ كُنتُمْ ﴾ .
ل ـ ﴿ أَوْلَادكُمْ لِلذَّكَرِ ﴾ .
ن ـ ﴿ وَلَكُمْ نِصْفُ ﴾ .
هـ ـ ﴿ ثُمَّ أَنتُمْ هَؤُلاء ﴾ .
غ ـ ﴿عَلَيهِمْ غَير ﴾ .
و ـ ﴿ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴾ .
ى ـ ﴿ ذَلِكُمْ يُوعَظُ ﴾ .

**خوای گەورە دەفەرموویێت :** ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمۡ أَنَّ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةَ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴾ ﴿ فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ﴾ .

**تێبینی :** ئەگەر لە دوای ( مْ ) ـەوە هەر دوو پیتی ( و ، ف ) هات ئەوا ( مْ ) ـەكە جوانتر دەردەبڕین .

## ڕاهێنان و شیکارەکەی

**پرسیار** : **خوای گەورە دەفەرموویێت** : ﴿ يَوۡمَ يَأۡتِ لَا تَكَلَّمُ نَفۡسٌ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ وَسَعِيدٞ ﴾ ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴾ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴾ .

**وولاٌم :**

**یەکەم : لە هەر دوو ووشەی ﴿ فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ ﴾ کۆتای ووشەی یەکەم پیتی میمە ، وە سەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( شين ) هاتووە ، وە پیتی ( شين ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإظهار الشفوي ) کەواتە حوکمی میمە ساکنەکە ( الإظهار الشفوي )ـە .**

**دووەم : لە هەر دوو ووشەی ﴿ جَآءَكُم مُّوسَىٰ ﴾ ووشەی یەکەم بە پیتی ( الميم ) کۆتای هاتووە ، وە سەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( الميم )ـە ، وە پیتی ( الميم ) تاکە پیتی ( الإدغام الشفوي )ـە کەواتە حوکمی میمە ساکنەکە ( الإدغام الشفوي )ـە . وە هەروەها لە هەر دوو ووشەی ﴿ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴾ کۆتای ووشەی یەکەم پیتی میمە ، وە سەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( الظاد )ـە هاتووە ، وە پیتی ( الظاد ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإظهار الشفوي ) کەواتە حوکمی میمە ساکنەکە ( الإظهار الشفوي )ـە .**

**سێیەم : لە هەر دوو ووشەی ﴿ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ ﴾ ووشەی یەکەم بە پیتی ( الميم ) کۆتای هاتووە ، وە سەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( الباء )ـە ، وە پیتی ( الباء ) تاکە پیتی ( الإخفاء الشفوي )ـە کەواتە حوکمی میمە ساکنەکە ( الإخفاء الشفوي )ـە ، وە هەروەها لە هەر دوو ووشەی ﴿ رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ ﴾ کۆتای ووشەی یەکەم پیتی میمە ، وە سەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( الواو )ـە هاتووە ، وە پیتی ( الواو ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإظهار الشفوي ) کەواتە حوکمی میمە ساکنەکە ( الإظهار الشفوي )ـە . وە هەروەها لە هەر دوو ووشەی ﴿ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا ﴾ کۆتای ووشەی یەکەم پیتی میمە ، وە سەرەتای ووشەی دووەم پیتی ( النون )ـە هاتووە ، وە پیتی ( النون ) یەکێکە لە پیتەکانی ( الإظهار الشفوي ) کەواتە حوکمی میمە ساکنەکە ( الإظهار الشفوي )ـە .**

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار : لەم ئایەتانەی خوارەوە ئەحکامەکانی میمی ساکن دیاری بکە .**

**خوای گەورە دەفەرمووێت :** ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ۖ لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ۝١٠ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرْعَ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلْأَعْنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ .

**پرسیار : ئەگەر لەدوای میمی ساکن پیتی ( الواو ) هات چ حوکمێکی هەیە ؟**

وولاٌم : ________________________________ .

# مینگە ( الغنة )

مینگە ( غنة ) : دەنگێکە لە لووتەوەیە لە جسمی ( نون و میم ) دا هەیە بەگوێرەی دوو چرکە ( حرکة ) درێژ دەکرێتەوە .

## شوێنەکانی ( الغنة )

لە نۆ شوێن مینگە ( غنة ) مان هەیە : چواریان لە نون ، سێیانیان لە میم ، و إدغام کردنی ( الباء ) لەگەڵ میم ، و إدغام کردنی لامی ناساندن ( لام أل التعریف ) لەگەڵ نون .

### یەکەم : شوێنەکانی مینگە ( غنة ) لە نون

١ـ نونی شەددە دار ( النون المشدد ) .

وەکو : ﴿ إِنَّ كَيْدَكُنَّ ، عَلَيْهِنَّ ، التَّنُّورُ ﴾ .

٢ـ نون یان تەنوین کاتێك إدغام بکرێت لەگەل یەکێك لە پیتەکانی ( ينمو ) .

وەکو : ﴿ مَن يَقُولُ ، لَن نَّصْبِرَ ، وَمَن مَّعَكَ ، بَرْداً وَلَاشَرَابًا ﴾ .

٣ـ نون یان تەنوین کاتێك ( میم ) لەگەڵ ( الباء ) الإقلاب بکرێت .

وەکو: ﴿ يُنبِتُ لَكُم ، أَنبَأَكَ ، خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ .

٤ـ نون یان تەنوین کاتێك الإخفاء بکرێت لەگەڵ (١٥) پیتەکەی إخفاء .

وەکو: ﴿ أَن دَعَوْا ، مِنْ شَيْءٍ ، الْمَنصُورُونَ ﴾ .

### دووەم : شوێنەکانی مینگە ( غنة ) لە میم

١ـ میمی شەددە دار ( المیم المشدد ) ، وەکو : ﴿ ثُمَّ ، لَمَّا ، وَأَتِمُّوا ﴾ .

٢ـ میم کاتێك إدغام بکرێت لە میم ، وەکو : ﴿ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ، فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ﴾ .

٣ـ میم کاتێك إخفاء ( المیم المخفي ) لە ( ب ) وەکو : ﴿ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ، تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ ﴾ .

## سێیەم : شوێنەکانی مینگە ( غنة ) لە ( الباء )

تێهەڵکێش ( إدغام ) کردنی ( ب ) لە ( م ) لە سورەتی هود ( ٤٢ ) تەنها ئەم حاڵەتە هەیە لە قورئان .

﴿ يَا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنَا ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ يَا بُنَيَّ ارْكَمَّعَنَا ﴾ .

## چوارەم : شوێنەکانی مینگە ( غنة ) لە لام أل التعريف

کاتێك إدغام لام أل التعريف لە نون ، وەکو : ﴿ النَّارِ ، النَّاسِ ﴾ .

**تێبینی :** مینگە ( غنة ) ی نون یان میمی شەددە دار ( النون و الميم المشددين ) ئەگەر لە ناوەڕستی ووشە یان کۆتایی ووشەدا بێت لەکاتی وەستان ( وقف ) بە گوێرەی دوو چرکە ( حركة ) درێژی دەکەینەوە وەکو : ﴿ من الْجِنِّ ، وَلَا جَآنٌّ ﴾ ، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ( المد اللازم ) لە ﴿ وَلَا جَآنٌّ ﴾ کە شەش چرکە ( حركە ) یە .

# أحكام اللام

## حوکمەکانی لام

لامی زنندەدار ( اللام الساكنة ) دوو حاڵەتی هەیە :

١ ـ إدغام .

٢ ـ إظهار .

شوێنەکانی لام لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی ووشە دێت .

## یەکەم : لام لە سەرەتـای ووشە

لامی ناساندن ( لام أل التعريف ) دەچێتە سەر ناو ( اسم ) دەبێتە دوو بەش ئەوانیش :

أ ـ اللام الشمسية .          ب ـ اللام القمرية .

### أ ـ اللام الشمسية :

( الإدغـام الشمـسي ) تێهەڵکێـشانی لام لەگـەڵ پیتەکـەی کـە لـە دوایـەوە دێـت کاتێـك بگـات بـە پیتێك لە پیتەکانی لامی شەمسی ، بەوەش دەزانین ( لام ) ـەکە ناخوێنرێتـەوە بـەڵکو تێهـەڵکێش ( إدغام ) دەکرێت بە پیتەکەی دوای خۆیدا ئەگەر پیتەکەی دوای خۆی ( شدة ) ی لە سـەر بێـت ، کـە ژمارەیان ( ١٤ ) پیتە کۆبوونەتەوە لە پیتە یەکەمەکانی ئەم دێرە شعرە :

طِبْ ثُم صِلْ رَحِماَ تَفُزْ ضِفْ ذا نِعَمْ          دَعْ سُوءَ ظَنْ زُرْ شَرِيفَا لِلْكَرِمْ

نموونە :

| ژ | پیتی إدغام | ووشە | نموونە | ژ | پیتی إدغام | ووشە | نموونە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ط الطاء | طِبْ | وَالطَّيِّبَاتُ | ٨ | ن النون | نِعَمْ | مَلِك النَّاسِ |
| ٢ | ث الثاء | ثُم | نِعْمَ الثَّوَابُ | ٩ | د دال | دَعْ | وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّه |
| ٣ | ص الصاد | صِلْ | وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ | ١٠ | س السين | سُوءَ | وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ |
| ٤ | ر الراء | رَحِماً | الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ | ١١ | ظ الظاء | ظَنْ | وَالظَّاهِرُ |
| ٥ | ت التاء | تَفُزْ | التَّائِبُونَ | ١٢ | ز الزاى | زُرْ | الزَّكَاةَ |
| ٦ | ض الضاد | ضِفْ | وَلَا الضَّالِّينَ | ١٣ | ش الشين | شَرِفًا | وَالشَّمْسَ |
| ٧ | ذ الذال | ذا | وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ | ١٤ | ل اللام | لِلْكَرِمْ | وَاللَّيْلِ |

## ب ـ اللام القمرية :

( الإظهار القمرى ) واتە ئاشكراكردن و دەرخستنى ( لام ) لە خوێندنەوەدا كاتێك بچێتە سەر پيتێك لە پيتەكانى لامى قەمەرى ، بەوەش دەزانين ( لام ) ەكە دەخوێنرێتەوە ئەگەر پيتەكەی دوای خۆی ( شدة ) ی لەسەر نەبێت ، وە ژمارەی پيتەكانى ( ١٤ ) پيتە كۆبوونەتەوە لە بڕگەی :

( ابْغِ حَجَّكَ وَخَفْ عَقِيمَهُ ) .

نموونە :

| ژ | پيتەكانى إظهار | نموونە | ژ | پيتەكانى إظهار | نموونە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ء الهمزة | الْأُولَ | ٨ | خ الخاء | الخالق |
| ٢ | ب الباء | الباقي | ٩ | ف الفاء | الفتاح |
| ٣ | غ الغين | الغني | ١٠ | ع العين | العليم |
| ٤ | ح الحاء | الحج | ١١ | ق القاف | القمر |
| ٥ | ج الجيم | الجنة | ١٢ | ى الياء | اليوم |
| ٦ | ك الكاف | الكريم | ١٣ | م الميم | الملك |
| ٧ | و الواو | الودود | ١٤ | هـ الهاء | الهدى |

## دووەم : لام لە ناوەڕستى ووشە

لام لە ناوەڕستى ووشە دەچێتە سەرناو ( اسم ) يان دەچێتەسەر فعل پێويستە بخوێنرێتەوە .

**نموونە لەسەرناو ( اسم ) :**

( أَلْسِنَتِكُم ، أَلْوانِكُم ، سُلْطنا ) .

**نموونە لە سەر فرمان ( فعل ) :**

( أَنْزَلْنَاهُ ، جَعَلْنا ، قُلْنا ) .

## سێیەم : لام لەکۆتایی ووشە

لام لەکۆتای ووشە دەچێتە سەر حەرف و فرمان ( فعل ) .

وەکو : ﴿ هل ، بل ، قل ، اجعل ﴾ .

بەڵام ئەگەر لەدوای لامەکە هەر دوو پیتی ( ل ، ر ) هاتن ئەوا پێویستە إدغام بکرێت .

**نموونەی إدغام ( ل ) لە ( ل ) :**

﴿هَل لَّكُم ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ هَلَّكُم ﴾ .

﴿ وَاجْعَل لِّي ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ واجْعَلِّي ﴾ .

﴿ قُل لاَّ أَقُولُ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــ ﴿قُلاَّ أَقُولُ ﴾ .

**نموونەی إدغام ( ل ) لە ( ر ) :**

﴿ بَل رَّفَعَهُ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ بَرَّفَعَهُ ﴾ .

﴿ بَل رَّبُّكُمْ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ بَرَّبُّكُمْ ﴾ .

﴿ وَقُل رَّبِّ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ وَقُرَّبِّ ﴾ .

وە پێویستە لە هەموو پیتەکانی تر إظهار بکرێت ، وەکو : ﴿ بَل سوَّلَت ، بَل طَبَع ، بَل نَحنُ ، بَل زَعَمتُم ، فَهَل تَرى ﴾ .

## ڕاهێنان و شکارەکەی

**پرسیار** : خوای گەورە دەفەرموویت :﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلاً ﴾ ﴿ وَفَعَلۡتَ فَعۡلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلۡتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾

**وولاٌم : یەکەم** : لەووشەی ﴿ ٱلۡأَمۡثَال ﴾ لامەکە قەمەریە چونکە لە دوای پیتی ( اللام ) پیتی (همزة ) هاتووە ، وە پیتی ( همزة ) یەکێکە لە پیتەکانی لامی قەمەری کەواتە حوکمی لامەکە (إظهارة )ـە .

**دووەم** : لە ووشەی ﴿ ٱلَّتِي ﴾ لە دوای پیتی ( اللام ) پیتی ( اللام ) هاتووە ، وە پیتی ( اللام ) یەکێکە لە پیتەکانی شەمسی ، کەواتە حوکمی لامەکە ( إدغام )ـە ، وە هەروەها لە هەر دوو ووشەی

﴿ فَعَلْتَ ﴾ لامەکەیان ( إظهار ) دەکرێت ، وە هەروەها لەووشەی ﴿ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ لامەکە قەمەریە چونکە لە دوای پیتی ( اللام ) پیتی ( الکاف ) هاتووە ، وە پیتی ( الکاف ) یەکێکە لە پیتەکانی لامی قەمەری کەواتە حوکمی لامەکە ( إظهارة )ـە .

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار :** لەم ئایەتانەی خوارەوە حوکمەکانی لام دیاری بکە .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَـٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَـٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَـٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ .

**پرسیار :** لام چەند حوکمی هەیە ؟

**وولاَم :** ________________ .

**پرسیار :** ئەگەر پیتی ( القاف ) لەدوای لامی ساکن هات چ حوکمێکە ؟

**وولاَم :** ________________________________ .

**پرسیار :** پیتەکانی لامی قەمەری بژمێرە ؟

**وولاَم :** ______________________ .

**پرسیار :** لامی شەمسی چەند پیتە بەشعر بینووسە ؟

**وولاَم :** ____________________________ .

## مەدد و بەشەکانی

بریتی یە لە درێژکردنەوەی دەنگ بە پیتێك لە پیتەکانی مەدد .

مەدد سێ پیتی هەیە ئەوانیش : ( ا ، و ، ی ) .

أ ـ ( ئەلف ) خۆی ساکن بێت ، و پێشی فتحة بێت ، وەکو : ﴿ ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ ﴾ .

ب ـ ( واو ) خۆی ساکن بێت ، و پێشی ضمة بێت ، وەکو : ﴿ قُولُوا ﴾ .

ج ـ ( یاء ) خۆی ساکن بێت ، و پێشی کسرة بێت ،وەکو : ﴿ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ﴾ .

✍ هەر سێ پیتەکەی مەدد کۆبوونەتەوە لە ووشەی ( نُوحِيهَا ) .

﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ ( سورة هود : ٤٩ ) .

## مەدد دەكرێت بەدوو بەشی سەرەكی یەوە

١ ـ مەددی بنەڕەتی ( المد الأصلي ) :

٢ ـ مەددی لاوەكی ( المد الفرعي ) :

## ا ـ مەددی بنەڕەتی ( المد الأصلي )

بریتیە لە سێ پیتەكەی مەدد بەمەرجێك بەدوایاندا پیتی ( همزة ) یان زەننە ( سكون ) نەهاتبێت ، ئەندازەی درێژكردنەوەی دوو چركە ( حركة ) یە ، هەروەها پێیشی دەوترێ مەددی ئاسایی ( طبيعي ) .

**نموونە :** الألف : ﴿ ذَلِكَ ، لَا تَفْرَحُ ، شَانِئَكَ ﴾ .

الواو : ﴿ قُولُواْ ، مَاتُوا ، وَمَا قُتِلُواْ ﴾ .

الياء : ﴿ لِي ، عَمَلِي ، لِحَيَاتِي ﴾ .

## پاشكۆكانی مەددی ئاسایی ( ملحقات المد الطبيعي )

١ ـ مەددی گۆڕاو ( مد البدل ) .

٢ ـ مد العوض .

٣ ـ الألف في هجاء أحرف ( حي طهر ) .

٤ ـ مد الصلة الصغرى .

درێژكردنەوەیان ( مقدار مد ) دوو چركە ( حركة ) یە .

## ١ ـ مەددی گۆڕاو ( مد البدل )

ئەو جۆرە مەددەیە کە لە دوو ( همزة ) پێك دێت کە یەکەمیان بزواو ( متحرك ) بێت و دووەمیان ( ساکن ) بێت ، ( همزة )ی دووەم کە ( ساکن ) ـە دەگۆڕین بۆ پیتێکی هاوشێوەی حەرەکەی ( همزة )ی یەکەم .

**وەکو :**

ءَ ⌒ ءْ ⟵ ءَ ءْ منَ ⟵ ءامن

ءُ ⌒ ءْ ⟵ ءُ ءْ ذوا ⟵ أُوذوا

ءِ ⌒ ءْ ⟵ ءِ ءْ مان ⟵ إيمان

**تێبینی :**

ئەگەر لە ووشەیەك دوو ( همزة ) پێکەوە هاتن یەکەمیان هەمزەی ( وصل ) بوو ، و دووەمیان هەمزەی ( قطع ) بوو پێویستە هەمزەی وصل بسڕینەوە ، وەکو :

﴿ الَّذِي ٱؤْتُمِنَ ﴾

( وصل ) ( قطع )

## ٢ ـ مد العوض

گۆڕینی تەنوینی ( منصوب ) بۆ ئەلف لەکاتی وەستان ( وقف ) دا ، بەلاّم لە ( تاء التأنيث المربوطة ) نابێت بە ئەلف ، وەکو :

﴿ مُقْتَدِراً ﴾ ـــــ لە وقف دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ مُقْتَدِرا ﴾ .

﴿ مَآءً ﴾ ـــــ لە وقف دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ مَآءا ﴾ .

﴿ عِزًّا ﴾ ــــــــــ لە وقف دەخوێنرێتەوە بە ــــــــــ ﴿ عِزَّا ﴾ .

﴿ عَزِيزًا ﴾ ــــــ لە وقف دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ عَزِيزا ﴾ .

بەڵام لە ( تاء التأنيث المربوطة ) لە کاتی وەستان دەبێت بە ( هاء )ی ( ساكن ) ، وەکو :

﴿ قَرْيَةٍ ﴾ ــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــــــ ﴿ قَرْيَهْ ﴾.

﴿ الْمُطْمَئِنَّةُ ﴾ ــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ الْمُطْمَئِنَّهْ ﴾ .

﴿ ءَامِنَةً ﴾ ــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ ءَامِنَهْ ﴾ .

## ٣ ـ الألف في هجاء الأحرف ( حى طهر ) من فواتح السور

ژمارەیان پێنج پیتە کۆکراونەتەوە لە ووشەی ( حى طهر ) ، خوێندنەوەی ئەو پیتانەی کە دوو پیتن ، یەکێکیان پیتەکەیە ئەوی تر ( الألف ) ی زیادەیە ، وە درێژکردنەوەی مەدیان ( مقدار المد) دوو چرکەیە ، بەبێ زیاد کردنی همزة بۆ دوای ( الألف ) .

وەکو : ﴿ حا ، يا ، طا ، ها ، را ﴾ .

**نموونە :** ( حم ـ حا ) ، ( يس ـ يا ) ، ( طه ـ طاها ) ، ( الر ـ را ) ، ( طس ـ طا ) ، ( كهيعص ـ .. هايا .. ) .

## ٤ ـ مەددی ( الصلة الصغرى )

ئەو ڕاناوە ( هاء الضمير ) ـەیە کە بۆ تاکێکی ئامادە نەبووی نێر ( مذكر غائب ) بەکاردێت و دەکەوێتە کۆتایی ووشەوە لە نێوان دوو پیتی بزواو ( متحرك ) بەمەرجێك ( همزة قطع ) لە دوای نەهاتبێت ئەو کاتە ( هاء ) ـەکە دەگۆڕین بۆ ( هى ) یان ( هو ) ، ئەمیش یاساکەیە :

| ــــَـُـِــ + ــهُـِ + ــــَـُـِــ |
|---|

**تێبینی :**

١ ـ دەبێت پێشی ( هاء ) و ( هاء ) ـەکە و دوای ( هاء ) ـەکە بزواو ( متحرك ) بێت .

٢ ـ نابێت ( همزة القطع ) لە دوای بێت .

**نموونە :**

﴿ إِنَّهُ هُوَ ﴾ ـــــــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــــــ ﴿ إِنَّهُو هُوَ ﴾.

﴿ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ ﴾ ـ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ لَّهُو مَا فِي السَّمَاوَاتِ ﴾.

﴿ وَمِنْ ءايَاتِهِ خَلْقُ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ وَمِنْ ءايَاتِهِي خَلْقُ ﴾.

بەڵام ووشەی ﴿ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾ ( سورة الزمر : ٧ ) ، شاذة هەرچەندە یاساکەش تێدا جێبەجێ دەبێت بەڵام صلەی نادرێتێ .

**ئاگادارکردنەوە :**

لەم شەش ( هاء ) ـەی خوارەوە صلە نیە :

١ . ( هاء ) لە ووشەی ﴿ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾ کە پێشتر باسمان کرد .

٢ . ( هاء ) لە ووشەیەکی ئەصلی ، وەکو ( هاء ) لە : ﴿ فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴾ ، وە ( هاء ) لە : ﴿ لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعَن ﴾ .

٣ . ئەگەر ( هاء ) بکەوێتە نێوان دوو ساکن ، وەکو : ﴿ عَلَيْهِ الذِّكْرُ ﴾ .

٤ . ئەگەر ( هاء ) بکەوێتە نێوان بزواو ( متحرك ) و ساکن ، وەکو : ﴿ لَهُ الْمُلْكُ ﴾ .

٥ . ئەگەر ( هاء ) بکەوێتە نێوان ساکن و متحرك ، وەکو : ﴿ إِلَيْهِ كَنزٌ ﴾ ، بەڵام ووشەی ﴿ فِيهِ مُهَانًا ﴾ ( سورة الفرقان : ٦٩ ) شاذة هەر چەندە کەوتۆتە نێوان ساکن و متحرك ، بەڵام صلەی دەدرێتی بۆ موبالەغەکردن لە عذابی کافران .

٦ . ئەگەر ( هاء ) خۆی ساکن بێت ، وەکو : ﴿ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ ﴾ ، و ﴿ فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ﴾ .

## ٢ ـ مەددی لاوەکی ( المد الفرعي )

ئەو مەددەیە کە لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی پیتەکانی مەدد لەگەڵ پیتی ( همزة ) یان ( سکون) دروست دەبێت .

## یەکەم : مەددی لاوەکی ( المد الفرعي ) بەهۆی ( همزة ) سێ جۆرە ئەوانیش

**١ ـ المد الواجب المتصل .**

**٢ ـ المد الجائز المنفصل .**

**٣ ـ المد الصلة الكبرى .**

ماوەی درێژکردنەوەیان ( مقدار مد ) چوار یان پێنج چرکە ( حركه ) یە .

## ١ ـ مەددی پێویستی لکاو ( المد الواجب المتصل )

ئەو جۆرە مەددەیە کاتێك بەدوای یەکێك لە پیتەکانی مەدد دا پیتی ( همزة ) بێت لە یەك ووشەدا . ئـەم درێژکردنەوەیە پێویست ( واجب ) ـە چونکە گشت خوێنەران ( قراء ) کۆڕان لەسەر درێژکردنەوەی زیاد لە دوو چرکە ( حركه ) ، بۆیە پێی دەوترێت لکاو ( متصل ) چونکە لەیەك ووشە ڕوودەدات .

حرف المد + ء ــــــ لەیەك ووشە

**نموونە :** ﴿ جآء ، قُرُوءٍ ، النَّسِيءُ ، الْمَلاَئِكَة ﴾ .

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾﴿ إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٌ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ .

## ٢ ـ مەددی ڕێپێدراوی جیا ( المد الجائز المنفصل )

ئەو جۆرە مەددەیە کاتێك یەکێك لە پیتەکانی مەدد لە کۆتایی ووشەیەکدا بێت وە پیتی )

همزة ) لە سەرەتای ووشەیەکی تردا بێت . بۆیە پێی دەوترێت ( منفصل ) چونکە لە دوو ووشە ڕوودەدات .

**نموونە :** ﴿ يَآأَيُّهَا ، قوآ أَنفُسَكُمْ ، إِنَّآأَرْسَلْنَاك ﴾ .

**خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾

﴿ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُ ۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ .

## ٣ ـ المد الصله الكبرى

ئەو ڕاناوە ( هاء الضمير ) ـەیە کە بۆ تاکێکی ئامادە نەبووی نێر ( مذكر غائب ) بەکاردێت و دەکەوێتە کۆتایی ووشەوە لە نێوان دوو پیتی بزواو ( متحرك ) بەمەرجێك ( همزة قطع ) لە دوای هاتبێت ئەوکاتە ( هاء ) ـەکە دەگۆڕین بۆ ( هي ) ئەگەر ( هاء ) کسرة لە ژێربوو ئەوا ئەگەر ضمة لەسەری بوو ئەوا دەکەینە ( هو ) .

**نموونە :**

﴿ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ~أَنَا ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ وَهُوَ يُحَاوِرُهُو~ أَنَا ﴾ .

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ~ أَنَّه ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِي~ أَنَّه ﴾ .

﴿ عِندَ رَبِّهِ~ إِنَّهُ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ عِندَ رَبِّهِي~ إِنَّهُ ﴾ .

**خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾ ﴿ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيۡخًا كَبِيرًا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾

## دووەم : مەدد ی لاوەکی ( المد الفرعي ) بە هۆی ( سكون ) دوو جۆرە

**أ ـ مەددی توش هاتووو بە زننە ( مد سكونه عارض ) .**

**ب ـ مەددی زەننەداری ئەصلی ( مد سكونه أصلي ) .**

أ ـ مەددی توش هاتووو بە زەننە ( مد سکونە عارض ) دوو جۆرە :
١ ـ مەددی تووش هاتوو بەزەننە ( المد العارض للسكون ) .
٢ ـ مەددی لین ( المد اللين ) .

### ١ ـ مەددی تووش هاتوو بەزەننە ( المد العارض للسكون )

ئەو مەددەیە کە بەهۆی وەستان ( وقف ) دروست دەبێت کاتێك لەسەر ووشەیەك بوەستین کە پێش کۆتایی ووشەکە پیتێکی مەدد بێت ، پیتی کۆتایی دەبێت بە ساکن کە لەبنەڕەتدا ساکن نیە ، ئەو کاتە دەتوانین دوو یان چوار یان شەش چرکە ( حرکة ) درێژی بکەینەوە .

**نموونە :** ﴿ الْعَالَمِينَ ، تُكَذِّبَانِ ، يُؤْمِنُونَ ، الْعِقَابِ ، يَعْمَلُونَ ، الرَّحِيم ﴾ .

﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴾ ﴿ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولِۭ ﴾ .

### المد المتصل العارض :

ئەو جـۆرە مـەددەیە کـە پێش کۆتــایی ووشـەکە پیتێکـی مـەدد بێـت ، ئینجا پیتی ( همزة ) بێت ، ئەم جۆرە مەددە ناتوانین لە چوار چرکە ( حرکة ) کـەمتر درێـژی بکەینـەوە چونکە ( همزة ) ـەکە بەهێزە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەتوانین چوار یان پێنج یان شەش چرکە ( حرکة ) درێـژی بکەینـەوە بـەڵام لـەکاتی ڕۆشـتن ( وصـل ) دا دەتـوانین چـوار یـان پێـنج چـرکە ( حرکـة ) درێـژی بکەینەوە .

**نموونە :** ﴿ إِنَّمَا النَّسِيءُ ، ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ ، لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَآء ﴾ .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَآءً ﴾ .

### ٢ ـ مەددی لین ( مد اللين )

ئەو جۆرە مەددەیە کە ( واو ، ياء ) ساکن بێت و پێشی فتحة بێت ، ماوەی درێژکردنەوەیان ( مقدار مد ) دوو یان چوار یان شەش چرکە ( حرکە ) یە لە کاتی وەستان ( وقف ) ، بەڵام لە کاتی ڕۆیشتن ( وصل ) مەددی تێدا نیە .

ـَــــ + [ يْ / وْ ] = مەددی لین ( مد اللين )

**نموونه :** ﴿ السَّوْء ، الْبَيْتَ ، خَوْفٍ ﴾ .

﴿ لِإِيلَـٰفِ قُرَيْشٍ ۝١ إِۦلَـٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ۝٢ فَلْيَعْبُدُواْ رَبَّ هَـٰذَا ٱلْبَيْتِ ۝٣
ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴾ .

## ب ـ مەددی زەنندەداری ئەصلی ( مد سكونه أصلي ) :

**مەددی زەنندەداری ئەصلی ( مد سكونه أصلي ) مەددی پێویست ( المد اللازم ) ـە ، بریتییە لەبەیەکگەیشتنی یەکێك لە پیتەکانی مەدد لەگەڵ زەنندەیەکی هەمیشەیی ( سكون أصلي ) ، یان پیتێکی شەددە دار ( المشدد ) ئەندازەی درێژکردنەوەیان شەش چرکە ( حركه ) یە ، وە بۆیە پێی دەوترێت پێویست ( لازم ) چونکە پێویستە شەش چرکە درێژ بکرێتەوە .**

### ئەمیش دەکرێت بە دوو بەشەوە :

**١ ـ المد اللازم الكلمي :**

**٢ ـ المد اللازم الحرفي :**

**هەر یەکەش لە ( المد اللازم الكلمي و المد اللازم الحرفي ) دەبێت بە دوو بەشەوە ، هەروەکو لەم خشتەیەی خوارەوە دەردەکەوێت :**




## أ ـ مەددی پێویستی ووشەیی ( المد اللازم الكلمي ) :

ئەگەر مەددەکە لەیەك ووشەدا بێت . **ئەمیش دەبێت بە دوو بەشەوە** :

### ١ ـ مەددی پێویستی ووشەیی قورس ( المد اللازم الكلمي المثقل ) :

ئەو جۆرە مەددەیە کە لە دوای پیتێکی مەدد پیتێکی شەددە دار ( المشدد ) بێت لە ووشەدا .

**نموونە :** ﴿ يَتَمَآسَّا ، الضَّآلِّينَ ، الصَّآخَّةُ ، الطَّآمَّةُ ، أتُحَآجُّونِّي ﴾ .

### ٢ ـ مەددی پێویستی ووشەیی سووك ( المد اللازم الكلمي المخفف ) :

ئەو جۆرە مەددەیە کە لە دوای پیتی مەدد زەنگەی هەمیشەیی ( سکون أصلی ) دێت لە ووشەدا ، تەنها ووشەی (ءَآلْنَ ) هەیە لە قورئان لە دوو شوێن لە سورەتی یونس .

﴿ءَآلْنَ وَقَدْ كُنْتُمْ بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ ( یونس : ٥١ ) ، ﴿ءَآلْنَ وَقَدْ عَصَيْتَ ﴾ ( یونس : ٩١ ) .

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار** : لەم ئایەتانەی خوارەوە بەشەکانی مەدد دیاری بکە .

**خوای گەورە دەفەرموویت** : ﴿ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۗ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾

**پرسیار** : **جیاوازی لە نێوان** ( **المد الصلة الكبرى و المدالصلة الصغرى** ) **بکە ؟**

**وولاّم** : ________________________________ .

**پرسیار** : **ووشەی** ﴿ بِنَآءً ﴾ **و**﴿ بِمَآءٍ ﴾ **چ جۆرە مەدێکە ؟**

**وولاّم** : ________________________ .

**پرسیار** : **باسی مەددی لازم بکە ؟**

**وولاّم** : ____________ ؟

**پرسیار** : **ووشەی** ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ **چ جۆرە مەدێکە ؟**

**وولاّم** : __________________ ؟

**پرسیار** : **لە کاتی وەستان لەسەر ووشەی**﴿ تُخۡرَجُونَ ﴾ **چەند حرکە درێژدەکرێتەوە ؟**

**وولاّم** : ______________________________________ .

## حەوت ئەلفەکان

لە قورئاندا حەوت ئەلف هەیە لە کاتی وەستان ( وقف ) دەخوێنرێتەوە ، و لەکاتی بەردەوام بوون ( وصل ) ناخوێنرێتەوە ، و نیشانەی ( ° ) لەسەر ئەلفەکەیە .

**١ـ پیتی ئەلیفی ( أناْ )** ( العنكبوت : ٥٠ ) :

﴿ أَنَا نَذِيرٌ ﴾ :

﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾

لە ( وصل ) دا دەخوێنرێـەوە بە ( أَنَ نَذيرٌ ) .

لە ( وقف ) دا بە دەخوێنرێـەوە ( أَنَا ... نَذِيرٌ ) .

**٢ـ پیتی ئەلیفی ( لَّكِنَّاْ )** ( سورة الكهف : ٣٨ ) :

﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴾

لە ( وصل ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( لَّكِنَّ هُوَ اللَّه ) .

لە ( وقف ) دەخوێنرێتەوە بە ( لَّكِنَّا ... هُوَ اللَّهُ ) .

**٣ـ پیتی ئەلیفی ( الظنوناْ )** ( الأحزاب : ١٠ ) :

﴿ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾ .

لە ( وصل ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( الظُّنُونَ هُنَالِكَ ) .

لە ( وقف ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( الظُّنُونَا ... هُنَالِكَ ) .

**٤ـ پیتی ئەلیفی ( الرَّسُولَاْ )** ( الأحزاب : ٦٦ ) :

﴿ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾ .

لە ( وصل ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( وَأَطَعْنَا الرَّسُولَ وَقَالُوا ) .

لە ( وقف ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا ... وَقَالُوا ) .

**٥ ـ پیتی ئەلیفی ( السَّبِيلَاْ ) ( الأحزاب : ٦٧ ) :**

﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَاْ ﴾ .

**لە ( وصل ) دا دەخوێنرێتەوە بە ﴿ السَّبِيلَ رَبَّنَا ﴾ .**

**لە ( وقف ) دا دەخوێنرێتەوە بە ﴿ السَّبِيلَا ... رَبَّنَا ﴾ .**

**٦ ـ پیتی ئەلیفی ( سلاسلاْ ) ( الإنسان : ٤ ) :**

﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴾ .

**لە ( وصل ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( سَلَاسِلَ وَأَغْلَالًا ) .**

**لە ( وقف ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( سَلَاسِلَا ... وَأَغْلَالًا ) .**

**٧ ـ پیتی ئەلیفی ( قواريراْ ) ی یەکەم ( الإنسان : ١٥ ) :**

﴿ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَاْ ﴾ .

**لە ( وصل ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( كَانَتْ قَوَارِيرَ قَوَارِير ) .**

**لە ( وقف ) دا دەخوێنرێتەوە بە ( كَانَتْ قَوَارِيرَا ... قَوَارِير ) .**

## ئاگادارکردنەوە :

**دەتوانین لە کاتی وەستان ( وقف ) لەسەر ( سلاسلا ) بە دوو شێوە بخوێنرێتەوە :**

**شێوەی یەکەم : دەتوانین ئەلفەکەی بهێڵین : ( سلاسلا ) .**

**شێوەی دووەم : دەتوانین ئەلفەکەی نەهێڵین : ( سلاسل ) .**

## تێبینی :

**ألف ( ثمودا ) لە سورەتەکانی ( هود : ٦٨ ، الفرقان : ٣٨ ، العنكبوت : ٣٨ ، النجم : ٥١ ) دا لە کاتی وەستان ( وقف ) و ڕۆیشتن ( وصل ) یشدا ناخوێنرێتەوە .**

**وە هەروەها ( قواريرا ) ی دووەم لە سورەتی ( الإنسان : ١٦ ) بە هەمان شێوە ئەلفەکەی ناخوێنرێتەوە .**

## التقاء الساكنين

### گەشتنی دوو ساكن بەیەك

گەیشتنی دوو ساکن بە یەك ئەگەر وەصلی ووشەیەك بکەین کە کۆتاییەکەی مەدد بێت لە دوای ئەویش یەکەم پیتەکەی ساکن بێت ، ئەوا پیتی مەددەکە دەسڕینەوە لەبەر ئەوەی ( التقاء الساكنين ) ڕوودەدات ، واتە گەیشتنی دوو ساکن بەیەك .

**نموونە :**

﴿ مُحِلِّي الصَّيْدِ ﴾ ـــــ لە وصل دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ مُحِلِّ الصَّيْدِ ﴾ .
﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ ﴾ ـــــ لە وصل دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ اهْدِنَ الصِّرَاطَ ﴾ .
﴿ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ ﴾ ـــــ لە وصل دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ آمَنُ اتَّقُ اللّهَ ﴾ .

## الإستعلاء

ئەو پیتانەن کە لە کاتی خوێندنەوەدا زمان بەرز دەبێتەوە بۆ لای هاروی سەرەوە بە قەڵەوی دەردەبڕدرێن ، ژمارەیان حەوت پیتە کۆبوونەتەوە لە ووشەکانی ( خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ ) .

**نموونە :** ( دَخَلوا ، قُولُوا ، مُقْمَحُون ، طَبَعَ ، لِلطَّائِفِينَ ) .

### پلەکانی الإستعلاء ( مراتب الإستعلاء ) :

١ ـ کاتێك لە دوای پیتی الإستعلاء ألف بێت ، وەکو : ﴿ الْقَانِتِينَ ، الْخَاشِعِينَ ، الْغَائِبِينَ ، لِلطَّائِفِينَ ﴾ .

٢ ـ کاتێك پیتی الإستعلاء فتحة لەسەری بێت ، وەکو : ﴿ ضَرَبَ ، طَبَعَ ، دَخَلوا ﴾ .

٣ ـ کاتێك پیتی الإستعلاء ضمة لەسەری بێت ، وەکو : ﴿ ضُرِب ، طُوبى ، قُولُوا ﴾ .

٤ ـ کاتێك پیتی الإستعلاء ساکن بێت و پێشی فتحة بێت ، وەکو : ﴿ مَطْلَعِ الفَجر ، مَغْرِب الشَّمس ﴾ .

٥ ـ کاتێك پیتی الإستعلاء ساکن بێت و پێشی ضمة بێت ، وەکو : ﴿ مُقْمَحُون ، الْمُطْمَئِنَّةُ ﴾ .

٦ ـ کاتێك پیتی الإستعلاء کسرة بێت وەکو : ﴿ دُخِلَت ، قِسمة ، ضِيزى ﴾ .

٧ ـ کاتێك پیتی الإستعلاء ساکن بێت و پێشی کسرة بێت ، وەکو : ﴿ إِخْراج ، إِطْعام ﴾ .

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار :** لەم ئایەتانەی خوارەوە پیتەکانی ( الإستعلاء ) دیاری بکە .

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا
نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٩ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ
نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٠
يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ٢١
قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا
دَٰخِلُونَ ﴾ .

## قەلقەلە

**قەلقەلە :** دەنگێکی زیادەیە لە دوای دەرچوونی پیتەکە بەزەقی دەردەبڕێت ، لە پێنج پیتدا کۆبوونەتەوە لەم برگەیەدا : ( قطب جد ) .

### دوو جۆر قەلقەلەمان هەیە :

#### ١ ـ قەلقەلەی بچووک ( القلقلة الصغرى ) :

ئەم جۆرە کاتێك دەبێت بکەوێتە ناوەڕاستی ووشەوە ، بەمەرجێك دەبێت ساکن بێت یان لە کۆتاییدا بێت لە وصل کردندا .

**نموونە :**

﴿ تَقْتُلُونَ ، مَطْلَع ، يُبْصِرُونَ ، تَجْعَلُونَ ، الْعَدْل ﴾ .

#### ٢ ـ قەلقەلەی گەورە ( القلقلة الكبرى ) :

ئەم جۆرە کاتێك دەبێت بکەوێتە کۆتایی ووشەوە ، و دەبێت لەسەری بوەستین .

**نموونە :**

﴿ خَلَقَ ، مُحِيط ، الْبَابَ ، الْبُرُوجِ ، الشَّدِيدِ ﴾ .

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار :** لەم ئایەتانەی خوارەوە جۆرەکانی قەلقەلە دیاری بکە .

﴿ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾

﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ۝١ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ۝٢ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ۝٣ قُتِلَ أَصْحَـٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴾ .

## مەخرەجی پیتەکان

شوێنی دەرچوونی پیتەکان ( مخارج الحروف ) : بریتییە لە شوێنی دەرچوونی پیتەکە لە کاتی دەربڕیندا ، یان ئەو شوێنەی کە دەنگی پیتەکە تێدا کۆتایی دێت و بەهۆیەوە لە پیتەکان جیادەکرێنەوە . مەخرەجەکانیش دوو جۆرن :

المخرج المحقق : ئەو مەخرەجەیە کە پشت دەبەستێت بە بەشێکی دیاریکراو لە بەشەکانی ( الحلق ) گەروو یان زمان یان هەردوو لێو یان ( الخیشوم ) لووت .

المخرج المقدر : بریتییە لەو بۆشاییەی کە لە نێوان ( حلق ) گەرو و دەم دایە ، کە مەخرەجی هەر سێ پیتەکەی مەددە.

### چۆنێتی دۆزینەوەی مەخرەج :

بۆ دۆزینەوەی مەخرەجی هەر پیتێك لە پیتەکان زەننە ( سکون ) بدە بە پیتەکە یان ( شدة ) ی لەسەر دابنێ و لەپاش هەمزەیەکی جووڵاو ( متحرك ) ەوە بیخوێنەرەوە ، لە هەر شوێنێکدا پیتەکە کۆتایی هات ئەوا مەخرەجی پیتەکەیە .

نموونە : بۆ دۆزینەوەی مەخرەجی ( باء ) دەڵێین : ( أبْ ) ، کەواتە مەخرەجی پیتی ( باء ) هەردوو لێوە .

### ژمارەی مەخرەجەکان :

لەسەر ڕای زۆرینەی خوێنەرانی قورئانی پیرۆز ( جمهور القراء ) مەخرەجی پیتەکان ( ١٧ ) مەخرەجن و دابەش دەبن بەسەر پێنج شوێنی سەرەکی کە ئەمانەن :

١ . ( الجوف ) بۆشایی نێوان گەروو و دەم ( یەك مەخرەج ) .

٢ . ( الحلق ) گەروو ( سێ مەخرەج ) .

٣ . ( اللسان ) زمان ( دە مەخرەج ) .

٤ . ( الشفتان ) هەردوو لێو ( دوو مەخرەج ) .

٥ . ( الخیشوم ) لووت ( یەك مەخرەج ) .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :




## ١ ـ بۆشایی نێوان گەروو و دەم ( الجوف )

ئەو بۆشاییەیە لە ناو دەمدا کە لە ( حلق ) قوڕگەوە دەست پێ دەکات تاکو ناو دەم ، پیتەکانی مەدد لە خۆدەکرێت کە ئەمانەن :

أ ـ ( ئەلفی ) زەننەدار ( ساکن ) بێت کە پیتی پێشەوەی ( فتحة ) لەسەر بێت .

ب ـ ( واو ) ێکی زەننەدار ( ساکن ) کە پیتی پێشەوەی ( ضمة ) لەسەر بێت .

ج ـ ( ی ) ی زەنندەدار ( ساکن ) کە پیتی پێشەوەی ( کسرة ) لە ژێر بێت .

ئەم مەخرەجە ( تقدیری ) مەزەندەکراوە و شوێنێکی دیاری کراوی نیە و لە نێوان قورگ و دەمدایە و کۆتایی دێت بەکۆتایی هاتنی دەنگەکە لە هەوادا ، هەر لەبەر ئەمەشە کە پێیان دەوترێت پیتە هەواییەکان ( الحروف الهوائیة ) .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :




## ٢ ـ قورگ ( الحلق )

لە قورگدا سێ مەخرەج هەیە کە شەش پیتن ئەوانیش :

أ ـ ( أقصى الحلق ) ئەوپەڕی قورگ : ( کە لە سنگەوە نزیکە ) هەر دوو پیتی ( ء ) و ( ه ) ی لێوە دەردەچێت .

ب ـ ( وسط الحلق ) ناوەڕاستی قورگ : هەر دوو پیتی ( ع ) و ( ح ) ی لێوە دەردەچێت .

ج ـ ( أدنى الحلق ) ئەم پەڕی قورگ : ( کە لە دەمەوە نزیکە ) هەر دوو پیتی ( خ ) و ( غ ) ی لێوە دەردەچێت .

وە پێی دەوترێت پیتەکانی حلق ( الأحرف الحلقیة ) چونکە لە ( حلق ) ـەوە دەردەچێن .




**٣ ـ زمان ( اللسان )**

زمان دە مەخرەجی هەیە وە ( ١٨ ) پیت دەگرێتەوە ، وە زمان دەبێت بە چوار بەش ئەوانیش ( **طرف** ) سەر زمان ، ( **حافتان** ) لێوار ، ( **وسط** ) ناوەڕاست ، ( **أقصى** ) ئەوپەڕی یان دوورترین شوێن .

**مەخرەجی یەکەم :** لە نێوان سەری زمان ( طرف اللسان ) و نوکی بڕەڕەکانی سەرەوە ( أطراف الثنايا العليا ) هەر سێ پیتی ( **ث** ، **ذ** ، **ظ** ) دەردەچێت .

وەکو لەم وێنانە دەبینرێت :




**مەخرەجی دووەم :** لە نێوان سەری زمان ( طرف اللسان ) لەگەڵ بڕەڕەکانی سەرەوە و خوارەوە ( الثنايا العليا والسفلى ) هەر سیٚ پیتی ( ص ، ز ، س ) دەردەچێت . وە پێشی دەوترێت ( حروف الصفير ) .

وەکو لەم وێنانە دەبینرێت :



**مەخرەجی سێیەم :** لە نێوان سەری زمان ( طرف اللسان ) لەگەڵ پووکی بڕەڕی سەرەوە ( أصل الثنيتين العليين ) هەر سێ پیتی ( ت ، د ، ط ) دەردەچێت .

وەکو لەم وێنانە دەبینرێت :




**مەخرەجی چوارەم :** لە نێوان نوکی زمان ( رأس اللسان ) لەگەڵ پشتی زمان دەدات لە پووکی ددانەکانی سەرەوە ( لثة الثنيتين العليين ) پیتی ( ر ) دەردەچێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :



**مەخرەجی پێنجەم :** نووکی زمان ( رأس اللسان ) ئەوەی کە لێوە نزیکە دەدات لە پووکی ددانەکانی سەرەوە ( لثة الثنيتين العليين ) پیتی ( ن ) دەردەچێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :




**مەخرەجی شەشەم :** لە نێوان هەر دوو لێواری زمان ( حافتي اللسان ) دەدات لە بنەڕەتی ددانەکانی سەرەوە ( لثة الثنيتين العليين ) پیتی ( ل ) دەردەچێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :



**مـەخرەجی حەوتـــەم :** یـەکێك لـە لێوارەکـانی زمـان ( حـافتی اللـسان ) دەدات لـە دانـەخرِێکانی بەشـی سـەرەوە ( الأضـراس العليـا ) پیتـی ( **ض** ) دەردەچـێت ، بـەڵام لێواری چەپی زمان لەگەڵ دانەخرِێکان ( الأضراس العليا ) بەکارهێنانی ئاسانترە .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :




**مــەخرەجی هەشـــتەم :** ناوەڕاســتی زمــان ( وســط اللــسان ) لەگـەڵ ئـەو بەشـەی بەرامبەریەتی لە ئاسمانەی سەرەوە ( حنك الأعلى ) هـەر سـێ پیتـی ( **ج** ، **ش** ، **ی غير المدية** ) دەردەچێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنانە دەبینرێت :


مخرج الجيم
وسط اللسان مع
وسط الحنك الاعلى
- ٢٨ -


مخرج الشين
وسط اللسان مع
وسط الحنك الاعلى
- ٢٩ -


مخرج الياء
وسط اللسان مع
وسط الحنك الاعلى
- ٣٠ -

**مـــەخرەجی نۆیــــەم :** ( أقــصى اللــسان ) کۆتــایی زمــان لەگــەڵ ئــەو بەشــەی کەبەرامبەریەتی لە ئاسمانەی سەرەوە ( حنك الأعلى ) پیتی ( ك ) دەردەچێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :




**مـــەخرەجی دەیــــەم :** ( أقــصى اللــسان ) کۆتــایی زمــان لەگــەڵ ئــەو بەشــەی کــە بەرامبەریەتی لــە ئــاسمانەی ســەرەوە ( حنك الأعلى ) دوای مەخرەجی ( ك ) ، پیتی ( ق ) دەردەچێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :



## ٤ـ هەر دوو لێو ( الشفتان )

هەر دوو لێو ( الشفتان ) دوو مەخرەجی هەیە ، و چوار پیت دەگرێتەوە :

١ ـ نووکی ددانەکانی سەرەوە ( رأس الثنیتین العلیین ) دەدات لە ناوەوەی لێوی خوارەوە ( باطن الشفه السفلی ) پیتی ( ف ) دەردەچێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :



٢ . لە نێوان هەر دوو لێو ( الشفتين ) هەر سێ پیتی ( و ، م ، ب ) دەردەچێت ، پیتی ( و ) بە کردنەوەی هەر دوو لێو وە هەر دوو پیتی ( م ، ب ) بە داخستنی هەر دوو لێو دەبێت .
بەم شێوەیە کە لەم وێنانە دەبینرێت :









## ٥ ـ لووت ( الخيشوم )

**ئەمیش یەك مەخرەجی هەیە کە کۆتایی لووتە ( أقصى الأنف ) ـە ، هەر دوو پیتی ( م ، ن ) کە مینگە ( غنة ) ی هەیە .**

**بەم شێوەیە کە لەم وێنانە دەبینرێت :**



# سیفەتی پیتەکان

سیفـەتی پیتەکـان ( صفات الحروف ) : بریتییە لـەو سیفـەت و تایبەتمەندیانەی کــە بـەهــۆیەوە پیتــەکانی پــێ دەنـــاسرێتەوە ، و لـــە یــەکتر جیـــادەکرێنەوە ، و سیفەتــەکــانیش دوو جــۆرن :

## یەکەم : سیفەتە هۆگرەکان ( الصفات اللازمە )

ئـەو سـیفەتانەن کە بەشـێکن لـە پیتەکە و لێی جیانابنـەوە ، وە ژمارەیـان ( ١٧ ) سـیفەتە . وە دەبن بە دوو بەشەوە ئەوانیش :

أ . سیفەتە دژ یەکەکان ( الصفات المتضادة ) :

ب . سیفەتە بێ دژەکان ( الصفات غیر المتضادة ) :

### أ ـ سیفەتە دژیەکەکان ( الصفات المتضادة )

ژمارەیـان ( ١٠ ) سـیفەتە ، و دابـەش دەبن بەسـەر پێنج کۆمـەڵ ، و لـە هـەر کۆمەڵەیەکدا دوو سـیفەتی دژبەیـەك هەیـە ئەگـەر لـە کۆمەڵیانـدا هـەبێت ئـەوا لـە بەرامبەرەکـەی نیـە ، کـە ئەمانـەی خوارەوەن :

١ ، ٢ / ( الهمس ) دژی ( الجهر ) ـە .

٣ ، ٤ / ( الشدة والبينية / التوسط ) دژی ( الرخاوة ) یە .

٥ ، ٦ / ( الإستعلاء ) دژی ( الإستفال ) ـە .

٧ ، ٨ / ( الإطباق ) دژی ( الإنفتاح ) ـە .

٩ ، ١٠ / ( الإذلاق ) دژی ( الإصمات ) ـە .

١ ، ٢ / ( الهمس ) دژی ( الجهر ) ـە :

**الهمس :** ڕێکردنی هەناسە لە کاتی دەربڕینی پیتەکە ، لەبەر لاوازی پشت بەستنیان بە مەخرەجەکانیان کە ژمارەیان ( ١٠ ) پیتە کۆکراونەتەوە لەم بڕگەیە : ( فَحَثَّهُ شَخْصٌ سَكَتْ ) .

**الجهر :** ڕێنەکردنی هەناسە لەکاتی دەربڕینی پیتەکە ، لەبەر بەهێزی پشت بەستنی بە مەخرەجەکەیەوە ، ژمارەیان ( ١٩ ) پیتە کۆکراونەتەوە لەم بڕگەیە : ( عَظَمَ وَزْنُ قَارِئَ غَضَّ ذي طَلَب جِدٍّ ) .

٣ ، ٤ / ( الشدة والبينية / التوسط ) دژی ( الرخاوة ) یە :

**الشدة :** گیران یان ڕێنەکردنی دەنگ لە کاتی دەربڕینی پیتەکە ، لەبەر تەواوی پشت بەستنی پیتەکە بەمەخرەجەکەی ، ژمارەیان ( ٨ ) پیتە کۆکراونەتەوە لەم ووتەیە ( أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ ) یان ( أجدك تطبق ) .

**الرخاوة :** ڕێکردنی دەنگ لە کاتی دەربڕینی پیتەکە ، ژمارەیان ( ١٦ ) پیتە ئەوانیش ( ث ، ح ، خ ، ذ ، ر ، س ، ش ، ص ، ض ، ظ ، غ ، ف ، ه ، و ، ی ، ا ) .

**البينية ( التوسط ) :** ئەو سیفەتەیە لەنێوان الشدة و الرخاوة دەنگ تێدا بەتەواوی ناگیرێت وە بەتەواویش ناڕوات ، و ژمارەیان ( ٥ ) پیتە کۆکراونەتەوە لە بڕگەی ( لِنْ عُمَر ) .

٥ ، ٦ / الإستعلاء دژی الإستفال :

**الإستعلاء :** بەرزکردنەوەی کۆتایی زمانە بەرەو ئاسمانەی دەم ، ژمارەیان ( ٧ ) پیتە کۆکراونەتەوە لە ووتەیە : ( خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ ) .

**الإستفال :** نەرم کردنەوەی کۆتایی زمان لە کاتی دەربڕینی پیتەکە ، ژمارەیان ( ٢٢ ) پیتە هەموو پیتەکانی زمانی عەرەبی دەگرێتەوە جگە لە پیتەکانی الإستعلاء .

٧ ، ٨ / الإطباق دژی الإنفتاح :

**الإطباق :** لکاندنی زۆرینەی زمان بەئاسمانەی دەمەوە ( حنك الأعلى ) لە کاتی دەربڕیندا ، و ژمارەیان ( ٤ ) پیتە کە بەهێزترین و قورسترین پیتن ئەوانیش ( ص ، ض ، ط ، ظ ) .

**الإنفتاح :** دوورخستنەوەی زمان یان زۆرینەی لە ئاسمانەی دەم ، لە کاتی دەربڕیندا ژمارەیان ( ٢٥ ) پیتە هەموو پیتەکان دەگرێتەوە جگە لە پیتەکانی الإطباق .

**تێبینی :** هەموو پیتەکانی الإطباق کە ( ص ، ض ، ط ، ظ ) ـە ، سیفەتی ( الإستعلاء ) یان هەیە ، بەڵام هەموو پیتەکانی الإستعلاء سیفەتی ( الإطباق ) یان نیە .

**٩ ، ١٠ / الإذلاق دژی الإصمات :**

**الإذلاق :** دەربڕینی پیتەکە بە خێرایی لەبەر دەرچوونیان لە پێشەوەی زمان یان هەر دوو لێو ، ژمارەیان ( ٦ ) پیتە کۆبوونەتەوە لەم ووتەیە ( فَرّ مِنْ لُبْ ) .

( ل ، ن ، ر ) مەخرەجیان سەری زمانە ( طرف اللسان ) .

( ف ، م ، ب ) مەخرەجیان هەر دوو لێوە ( الشفة ) .

**الإصمات :** قورسی دەربڕینی پیتەکان ، ژمارەیان ( ٢٣ ) هەمووی پیتەکانی زمانی عەرەبی دەگرێتەوە جگە لە پیتەکانی الإذلاق.

## ب ـ سیفەتە بێ دژەکان ( الصفات غير المتضادة )

سیفەتە بێ دژەکان ( الصفات غير المتضادة ) ( ٧ ) سیفەتن کە ئەمانەن :

**١ـ الصفير :**

دەنگێکە لە دەنگی باڵندە دەچێت لە کاتی دەربڕینی پیتەکە دێتە دەرەوە ( ٣ ) پیتن ئەوانیش ( ص ، س ، ز ) .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :



**٢ـ القلقلة :**

**دەنگێکی زیادەیە لە دوای دەرچوونی پیتەکە بەزەقی دەردەبڕدرێت کە ژمـارەیان ( ٥ ) پیتە کۆبوونەتەوە لەم ووتەیە : ( قطب جد ) پێشتر لە لاپەڕە ( ٥١) باس کراوە . .**

**بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :**




**٣ـ اللين :**

**( و ، ی ) ساکن بێت وە پێشیان فتحة بێت ، دەرچوونی پیتەکـە لـە مەخرەجەکەیـەوە بە ئاسانی .**

**٤ـ الإنحراف :**

**لادان ، لادانی پیتەکە لە مەخرەجەکەیەوە بۆ مەخرەجێکی تر لـە کاتی دەرپڕیندا ئەویش هەر دوو پیتی ( ل ، ر ) دەگرێتەوە .**



**٥ ـ التكرار :**

لەرینەوەی سەری زمان لە کاتی دەربڕینی پیتەکە ، ئەمیش تەنها پیتی ( ر ) دەگرێتەوە ، ئەم سیفەتە دەزانرێت بۆ ئەوەی نەکرێت .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :




**٦ ـ التفشي :**

بەڵاوبوونەوەی هەوا لە ناو دەم لە کاتی دەربڕینی پیتەکە ئەمیش تەنها یەك پیت دەگرێتەوە کە پیتی ( ش ) ـە .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :



**٧ـ الإستطالة :**

درێژکـردنــــەوەی پیتەکــە لـــە مـەخـرەجـەکـــەدا ئـەمیش تەنهــا پیتــی ( ض ) ــە ، وە درێژبـــوونەوەی دەنگەکـــەی لـــە ســـەرەتای لێواری زمــانەوە تــاوەکو کۆتاییەکـەی ، وە ئـــەم درێژبــوونــەوەیە بۆ ماوەی کەمتر لە دوو چرکە ( حرکة ) دەمێنێتەوە لە کاتی ( ض ) ی ساکن .

بەم شێوەیە کە لەم وێنەیە دەبینرێت :



## دووەم : سیفەتە تووشهاتووەکان ( الصفات العارضة ( الزائدة )

## قورس و سووک کردن ( التفخيم والترقيق )

### ١ ـ قورس کردن ( التفخيم )

**قورس کردن ( التفخيم ) دەبێت بە دوو بەشەوە :**

أ ئەو بەشەی بەردەوام بە قورس ( التفخيم ) دەردەبڕدرێن ، حەوت پیتەکەی ( الإستعلاء ) یە .

ب ئەو بەشەی کە هەندێ جار قورس ( التفخيم ) ـە ، و هەندێ جار سووک ( الترقيق ) ، چوار پیتن ئەوانیش ( ل ، ر ، الألف ، الغنة ) .

#### أ ـ پیتەکانی الإستعلاء :

پیتەکانی الإستعلاء بەردەوام قورس ( التفخيم ) ن ئەویش چەند پلەیەکی ( مرتب ) ـەی هەیە کە لە پێشتردا باسمان کردووە لە لاپەڕە ( ٤٢ ) دا .

#### ب ـ ئەو بەشەی کە هەندێ جار قورس ( التفخيم ) ـە ، و هەندێ جار سووک ( الترقيق ) ، چوار پیتن ئەوانیش ( ل ، ر ، الألف ، الغنة ) .

### یەکەم : قورس کردن و سووک کردنی پیتی ( ر ) ( تفخيم الراء وترقيقه ) :

پیتی ( ر ) هەندێ جار دەکەوێتە کۆتایی ووشەوە ، و هەندێ جار دەکەوێتە ناوەڕاست یان سەرەتای ووشە .

أ ـ ( الراء المتطرف ) ئەو ( ر ) ی کە دەکەوێتە کۆتایی ووشە .

ب ـ ( الراء غير المتطرف ) ئەو ( ر ) ی کە دەکەوێتە سەرەتا یا ناوەڕاستی ووشە .

## ❑ قورس کردنی ئەو ( الراء ) ـەی کە دەکەوێتە سەرەتا یا ناوەڕاستی ووشە ( التفخیم الراء غیر المتطرف ) ( ٧ ) حاڵەتی هەیە کە ئەمانەن :

١ . ئەگەر پیتی ( ر ) فتحة بێت ، وەکو : ﴿ رَحْمَةَ رَبِّكَ ، أرَءيت ، أَلَمْ تَرَ إلَى رَبِّكَ ﴾ .

٢ . ئەگەر پیتی ( ر ) ضمة بێت ، وەکو : ﴿ كَفَرُواْ ، الرُّعْبَ ، رُوحُ الْقُدُسِ ﴾ .

٣ . ئەگەر پیتی ( ر ) ساکن بێت ، و پێشی فتحة بێت ، وەکو : ﴿ أَرْسَلْنَا ، أَرْبَعِينَ ، مَّرْجِعُكُمْ ﴾ .

٤ . ئەگەر پیتی ( ر ) ساکن بێت ، و پێشی ضمة بێت ، وەکو : ﴿ الْمُرْسَلُونَ ، الْقُرْآنُ ، بِقُرْبَانٍ ﴾.

٥ . ئەگەر پیتی ( ر ) ساکن بێت ، و پێشی کسرەی عارض بێت ، وەکو : ﴿ ارْكَبُواْ ، وَارْجِعُوا ، ارْكَعُوا ﴾ .

٦ . ئەگەر پیتی ( ر ) ساکن بێت ، و پێشی کسرەی مفصل بێت ، وەکو : ﴿ الَّذِي ارْتَضَى ، إنِ ارْتَبْتُمْ ، رَبِّ ارْجِعُونِ ﴾ واته التقاء الساكنين بێت .

٧ ـ ئەگەر پیتی ( ر ) ساکن بێت ، و پێشی کسرەی أصلی بێت ، بەڵام لە دوای پیتی ( ر ) پیتێك لە پیتەکانی الإستعلاء بێت کە کسرة نەبێت ، وەکو : ﴿ قِرْطَاسٍ ، فِرْقَةٍ ، وَإِرْصَادًا ، مِرْصَادًا ، لَبِالْمِرْصَادِ ﴾ . تەنها ئەم پێنج ووشە هەیە لە قورئان .

## ❑ سووك کردنی ئەو ( الراء ) ی کە دەکەوێتە سەرەتا یان ناوەڕاستی ووشە ( الترقیق الراء غیر المتطرف ) ( ٢ ) حاڵەتی هەیە کە ئەمانەن :

١ . ئەگەر پیتی ( ر ) کسرة بێت ، وەکو : ﴿ مِنْ أَمْرِنَا ، غَيْرِكم ، مَّرِيجٍ ﴾ .

٢ . ئەگەر پیتی ( ر ) ساکن بێت ، و پێشی کسرەی أصلی بێت ، وەکو : ﴿ فِرْعَوْنُ ، شِرْعَةً ، مِرْيَةٍ ﴾ .

**تێبینی :** دەتوانین بە هەر دوو شێوە قورس و سووك ( التفخیم والترقیق ) ی پیتی ( ر ) بکەین کاتێك کە ساکن بێت ، و لە پێشی کسرەی أصلی بێت ، و لە دوایەوە یەکێك لە پیتەکانی استعلاء بێت ، بەڵام کسرة بێت ، ئەویش تەنها لە یەك ووشە هەیە لە قورئان کە ووشەی ﴿ فِرْقٍ ﴾ ( الشعراء / ٦٣ ) .

**❑ قورس كردنى ئەو ( الراء ) بكەوێتە كۆتـايي ووشـە ( تفخيـم الـراء المتطـرف ) ( ٤ )**

**حاڵەتى هەيە كە ئەمانەن :**

١ . ئەگەر پێشى ( ر ) فتحة بێت ، وەكو : ﴿ فَمُسْتَقَرْ ، وَلاتَذَرْ ، لِلْبَشَرْ ، وَالْعَصْرْ ، بِالصَّبْرْ ﴾ .

٢ . ئەگەر پێشى ( ر ) ضمة بێت ، وەكو : ﴿ بِالنُّذُرْ ، وَدُسُرْ ، وَسُعُرْ ، الْعُسْرْ ، خُسْرْ ﴾ .

٣ . ئەگەر پێشى ( ر ) الف بێت ، وەكو : ﴿ مَعَ الأَبْرَارْ ، عَذَابَ النَّارْ ، بِالأَسْحَارْ ﴾ .

٤ . ئەگەر پێشى ( ر ) واو بێت ، وەكو : ﴿ وَالطُّورْ ، مَّسْطُورْ ، مَّنشُورْ ﴾ .

**❑ سووك ( ترقيق ) كردنى ( ر ) ئەگەر بكەوێتە كۆتايي ووشەوە :**

( ر ) سـووك ( ترقيـق ) دەكرێـت كاتێك ساكن بێـت وە پێـشى كـسرة يـان ( يـاء ) سـاكن بێـت ، وەكو : ﴿ قُدِرْ ، مِن مُّدَّكِرْ ، قَدِيرْ ، خَبِيرْ ، بَصِيرْ ﴾ .

**تێبينى :** لە كاتى وەستان لە سەر ووشەى ( مِصْرَ ) بە قورس و سووك دەخوێنرێتـەوە ، بـەڵام بـە قـورس خـوێندنەوەى لـە پێـشترە ، و هـەروەهـا ووشـەى ( الْقِطْـرِ ) بـە قـورس وسـووك دەخوێنرێتەوە ، بەڵام بەسووك خوێندنەوەى لەپێشترە .

**دووەم : قورس و سووك كردنى ( ل ) ( تفخيم اللام وترقيقه ) :**

( ل ) قورس ( تفخيم ) دەكرێت لە ( لفظ الجلالة ) كاتێك پێشى كسرة نەبێت .

**وەكو :** ﴿ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ ، ﴿ اللّهُ رَبُّكُمْ ﴾ ، ﴿ اللّهِ الَّذِي لَـهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ ﴾ ، ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ، ﴿ كَانَ اللّهُ ﴾ ، ﴿ رَسُولُ اللَّه ﴾ ، ﴿ يُرِيدُ اللّهُ ﴾ .

( ل ) سووك ( ترقيق ) دەكرێت كاتێك پێشى كسرة بێت .

**وەكو :** ﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ ﴾ ، ﴿ قُلِ اللَّهُمَّ ﴾ ، ﴿ لِلَّهِ ما فِي السَّمَاوَاتِ ﴾ .

**ئاگاداركردنەوە :** دەبێت ئاگادارى ئـەوە ببين كـە لـە هەندێ حاڵەتدا پيتـى ( الـلام ) قورس دەكرێتەوە بە تايبەتى ئەگەر پيتـى ( الـلام ) لەگەڵ يـەكێك لـە پيتـەكانى ( ط ، ص ، ظ ، ض ) هـاتن وەكـو ( الـصَّلاةَ ، الظَّـالِمِينَ ، سُـلْطَانٌ ، الـضَّلاَلُ ) ، بـۆيــە نـابێت پيتــى ( الـلام ) بـە قـورس بخوێنرێتەوە تەنها لە لفظ الجلالة ( الله ) ئەويش كاتێك پێشى كسرة نەبێت كە لە پێشتر باسمان كرد .

## سێیەم : قورس و سووك كردنی ألف ( تفخيم الألف وترقيقه ) :

( الألف ) قورس ( تفخيم ) دەكرێت لـه دوای پیتـه قورس ( تفخيم ) ـەكان و ســووك ( ترقيق ) دەكرێت لە دوای پیتە سووك ( ترقيق ) ـەكان .

نموونە لە قورس ( تفخيم ) : ﴿ الْقَانِتِينَ ، الْخَاشِعِينَ ، الْغَائِبِينَ ، لِلطَّائِفِينَ ﴾ .

نموونە لە سووك ( ترقيق ) : ﴿ ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ ﴾ .

## چوارەم : قورس و سووك كردنی مینگە ( تفخيم الغنة وترقيقه ) :

مینگە ( غنة ) قورس ( تفخيم ) دەكرێت كاتێك الإخفاء نونی ساكن یان تـەنوین لەگـەڵ پێنج پیت لە پیتەكانی الإستعلاء كە ( الصاد ، الضاد ، الطاء ، الظاء ، القاف ) .

نموونە : ﴿ يَنصُرُونَ ، مِن صِيَامٍ ، مَنضُودٍ ، مِن ضَعْفٍ ، يَنطِقُونَ ، مِن طِينٍ ، يَنقَلِبُونَ ، مِن قَبْلُ ، يُنظَرُونَ ، مِن ظَلَمَ ﴾ .

لە هەموو پیتەكانی تر سووك ( ترقيق ) دەكرێت .

نموونە : ﴿ الإِنسَانُ ، كُنتُمْ ، مِن شَيْءٍ ، أَنفَقْتُم ، ﴾ .

### ڕاهێنان و ئەركی خوێندكار

پرسیار : لەم ئایەتانەی خوارەوە پیتە سووك و قورسەكان دیاری بكە .

خوای گەورە دەفەرموویّت : ﴿ وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ۝٣ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ۝٤ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ۝٥ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ۘ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴾ ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴾ ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ۝١١٥ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴾ .

# إدغام و بەشەکانی

تێهەڵکێش ( إدغام ) : واتە تێهەڵکێش ( إدغام ) کردنی کۆتایی ووشەیەك بە سەرەتای ووشەیەکی تر و شدة بۆ دووەم دادەنێین ، ئەمیش دەبێت بە دوو بەشەوە :

یەکەم : تێهەڵکێشی گەورە ( الإدغام الكبير ) .

دووەم : تێهەڵکێشی بچووك ( الإدغام الصغير ) .

## یەکەم : تێهەڵکێشی گەورە ( الإدغام الكبير )

گەیشتنی پیتێکی بزواو ( متحرك ) بە پیتێکی تری بزواو ( متحرك ) بە شێوەیەك ببنە پیتێکی شەددە دار ( المشدد ) .

ئەم جۆرە تێهەڵکێش ( إدغام ) ـە لە جۆری لێك چووەکان ( المتماثلين ) ـە ، و لە چەند ووشەیەکی کەم لە قورئاندا ڕوویداوە .

**وەکو :**

۞ ووشەی ( تَأْمَنَّا ) لە ئایەتی:﴿ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَـٰصِحُونَ ﴾ ( سورة يوسف : ١١ ) کە لە ئەسڵدا ( تأمنُنَا ) بووە .

۞ ووشەی ( أَتُحَاجُّونِّي ) لە ئایەتی : ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۗ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ ( سورة الأنعام : ٨٠ ) لە ئەسڵدا ( أَتُحَاجُّونَنِي ) بووە .

۞ ووشەی ( مَا مَكَّنِّي ) لە ئایەتی : ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴾ ( سورة الكهف : ٩٥ ) لە ئەسڵدا (مَا مَكَّنَنِي ) بووە .

۞ لە ووشەی ( تَأْمَنَّا ) پێویستە ( الإشمام یان الإختلاس ) بکرێت .

**الإشمام :** واتە : هەر دوو لێو دەجوڵێنین بە بێ دەنگ وەکو ( ضمة ) یەك .

**الإختلاس :** واتە : هێنانی بەشێك لە حرکەی ضمةی نوونەکە .

**تێبینی :** لە تێهەڵکێشانی گەورە ( الإدغام الكبير ) تەنها جۆری لێکچوو ( المتماثل ) هەیە لەلای ( حفص ) ، تێهەڵکێش ( إدغام ) ی ( متقارب ، متجانس ) نیە .

## دووەم : تێهەڵکێشانی بچووك ( الإدغام الصغير )

بریتییە لە تێهەڵکێشکردن ( إدغام ) کردنی پیتێکی زەنندار ( ساكن ) لەگەڵ پیتێکی بزواو ( متحرك ) بە شێوەیەك هەر دووکیان پیتێکی شەددە دار ( المشدد ) لە ڕەگەزی پیتی دووەم دروست بکەن ، **ئەمیش سێ جۆرە :**

**١ ـ تێهەڵکێشی پیتە لێکچووەکان ( إدغام المتماثلين ) .**
**٢ ـ تێهەڵکێشی پیتە هاوڕەگەزەکان ( إدغام المتجانسين ) .**
**٣ ـ تێهەڵکێشی پیتە نزیکەکان ( إدغام المتقاربين ) .**

## ١ ـ تێهەڵکێشی پیتە لێکچووەکان ( إدغام المتماثلين )

ئەو تێهەڵکێش ( إدغام ) کردنە لە دوو پیت ڕوودەدات کە لە مەخرەج و سیفەتدا وەکو یەك بن واتە یەك پیتن ... **وەکو :**

﴿ فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ فَمَا رَبِحَتِّجَارَتُهُمْ ﴾ .
﴿ إِذَا طَلَعَت تَّزَاوَرُ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ إِذَا طَلَعَتَّزَاوَرُ ﴾ .
﴿ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ يُدْرِكُّمُ الْمَوْتُ ﴾ .
﴿ وَقَد دَّخَلُوا ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ وَقَدَّخَلُوا ﴾ .
﴿ قُل لَّا أَقُولُ لَكُمْ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ قُلَّا أَقُولُ لَكُمْ ﴾ .
﴿ عَفَوا وَّقَالُوا ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ عَفَوَّقَالُوا ﴾ .

**تێبینی :** تێهەڵکێش ( إدغام ) کردن لە پیتەکانی مەدد ڕوونادات .
**وەکو :** ﴿ الَّذِي يُوَسْوِسُ ﴾ ، و ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ ﴾ .

## ٢ ـ تێهەڵکێشی پیتە هاوڕەگەزەکان ( إدغام المتجانسين )

ئەو تێهەڵکێش ( إدغام ) کردنە لە دوو پیت ڕوودەدات کە یەك مەخرەجیان هەیە بەلاَم لە سیفەتدا جیاوازن .

أ ـ الأحرف النطعية : هەر سێ پیتی ( ط ، ت ، د ) تێهەڵکێشانی ( إدغام ) التاء لە الطاء و بەپێچەوانەشەوە ، و التاء لە الدال و بەپێچەوانەشەوە .

ب ـ الأحرف اللثوية : هەر سێ پیتی ( ظ ، ذ ، ث ) تێهەڵکێشانی ( إدغام ) الثاء لە الذال ، و الذال لە الظاء .

ج ـ الأحرف الشفوية : تێهەڵکێشانی ( إدغام ) الباء لە الميم .

### أ ـ نموونە لەسەر پیتەکانی ( النطعية ) :

( التاء ) لە ( الطاء ) :

﴿ إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ إِذْ هَمَّطَّائِفَتَانِ ﴾ .

﴿ وَدَّت طَّآئِفَةٌ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ وَدَّطَّآئِفَةٌ ﴾ .

﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ وَقَالَطَّآئِفَةٌ ﴾ .

( الطاء ) لە ( التاء ) :

﴿ لَئِن بَسَطتَ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ لَئِن بَسَطتَ ﴾ .

﴿ فَرَّطتُمْ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ فَرَّطتُّمْ ﴾ .

﴿ فَرَّطتُ ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ فَرَّطتُّ ﴾ .

تێبینی : لە کاتی تێهەڵکێش ( إدغام ) کردنی ( ط ) لەگەڵ ( ت ) دا ، ئەوا لە کاتی خوێندنەوەی ( ط ) ەکە بە تەواوی تێهەڵکێش ( إدغام ) ناکەین ، بەڵکو قەلقەلەی ( ط ) ەکە ناکەین .

( التاء ) لە ( الدال ) :

﴿ أَثْقَلَت دَّعَوَا ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ أَثْقَلَدَّعَوَا ﴾ .

﴿ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ أُجِيبَدَّعْوَتُكُمَا ﴾ .

( الدال ) لە ( التاء ) :

﴿ قَد تَّبَيَّنَ ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ قَتَّبَيَّنَ ﴾ .

﴿ عَقَّدتُّمُ ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ عَقَّتُّمُ ﴾.

**ب . نموونە لەسەر پیتەکانی ( اللثوية ) :**

( الثاء ) لە ( الذال ) :

﴿ يَلْهَث ذَّلِك ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ يَلْهَذَّلِك ﴾ .

( الذال ) لە ( الظاء ) :

﴿ إِذ ظَّلَمُواْ ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ إِظَّلَمُواْ ﴾ .

﴿ إِذ ظَّلَمْتُمْ ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ إِظَّلَمْتُمْ ﴾ .

**ج ـ نموونە لەسەر پیتەکانی ( الشفوية ) :**

( الباء ) لە ( الميم ) :

﴿ ارْكَبْ مَعَنَا ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ ارْكَمَّعَنَا ﴾ .

## ٣ ـ تێهەڵکێشی پیتە لەیەك نزیکەکان ( الإدغام المتقاربين )

ئەو تێهەڵکێش ( إدغام ) کردنەیە لە دوو پیت ڕوودەدات کە لە مەخرەج و سیفەتدا لەیەك نزیکن .

أ ـ ( اللام ) لە ( الراء ) : ﴿ وَقُل رَّبِّ ﴾ ________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ وَقُرَّبِّ ﴾ .

ب ـ ( القاف ) لە ( الكاف ) : ﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّم ﴾ ___ دەخوێنرێتەوە بە _____ ﴿ أَلَمْ نَخْلُكُّم ﴾ .

بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە یەکەم إدغام تەواو واتە ( ق ) ـەکە بە تەواوی نامێنێت وەکو نموونەکەی سەرەوە .

دووەم پیتی ( ق ) بەتەواوی إدغام ناکەین بەڵکو قەلقەلەی پێ ناکەین .

﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّم ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّم ﴾ .

ج ـ نون لە پیتەکانی ( ينمو ) :

﴿ مَن يَعْمَلْ ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ مَيَعْمَلْ ﴾ .

﴿ مِن وَاقٍ ﴾ ____________ دەخوێنرێتەوە بە ________ ﴿ مِوَاقٍ ﴾ .

## ڕاهێنان و ئەرکی خوێندکار

**پرسیار : لەم ئایەتانەی خوارەوە حوکمەکانی إدغام دیاری بکە .**

**خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾ ﴿ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴾ ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ﴾ .

**پرسیار : ووشەی ﴿ نَخۡلُقكُّم ﴾ بەچەند شێوە دەخوێنرێتەوە ؟**

**وولاّم :** ______________________ ؟

**پرسیار : ئەگەر لەدوای پیتی ( الدال )ی ساکن پیتی ( التاء ) هات چ جۆرێکە لە إدغام ؟**

**وولاّم :** ______________________ .

**پرسیار : لە ئایەتی** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴾ **چ جۆرێك لە إدغام ڕوویداوە ؟**

**وولاّم :** ______________________ .

## همزة الوصل

ئـەو ( همـزة ) يەيـە كـە لـە كـاتی دەسـت پێكـردن دەخـوێنرێتەوە و لـە كـاتی وصـل نـاخـوێنرێتەوە ، و دەچێتە سـەر پيت ( حرف ) ، وە ناو ( اسم ) ، وە ( فعل ) ، و نيشانەيشی ( ٱ ) يە .

### أ ـ همزة الوصل لە پيت ( حرف ) دا :

لە پيت ( حرف ) تەنها دەچێتە سەر ( أل التعريف ) ، و لە كاتی دەست پێكردن بە مەفتوحی دەخوێنرێتەوە ... وەكو :

﴿ ٱلْعَالَمِينَ ٱلرَّحْمَنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ أَلْعَالَمِينَ رَّحْمَنِ رَّحِيمِ ﴾ .

### ب ـ همزة الوصل لە ناو ( اسم ) دا :

دەچێتە سەر ( ٧ ) ناو ( اسم ) كە لە قورئاندا هاتووە ، لە كاتی دەست پێكردن بە ( كسرة ) دەخوێنرێتەوە كە ئەمانەن: ﴿ ٱسْمُ ، ٱبْنُ ، ٱبْنَة ، ٱمْرُؤٌ ، ٱمْرَأَة ، ٱثْنَانِ او ٱثْنَيْنِ ، ٱثْنَتَانِ ، ٱثْنَتَيْنِ ﴾.

**نموونە :**

ٱسْمُ : ﴿ مِن بَعْدِي ٱسْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ ــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ مِن بَعْدِ سْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ .

ٱبْنُ : ﴿ عِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾ ـــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ عِيسَ بْنِ مَرْيَمَ ﴾ .

ٱبْنَة : ﴿ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَانَ ﴾ ــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ وَمَرْيَمَ بْنَةَ عِمْرَانَ ﴾ .

ٱمْرُؤٌ : ﴿ إِنِ ٱمْرُؤٌ هَلَكَ ﴾ ـــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ إِنِ مْرُؤٌ هَلَكَ ﴾ .

ٱمْرَأَة : ﴿ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ ﴾ ـــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ وَقَالَتِ مْرَأَتُ فِرْعَوْنَ ﴾ .

ٱثْنَانِ : ﴿ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ﴾ ــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ حِينَ لْوَصِيَّةِ ثْنَانِ ﴾ .

ٱثْنَيْنِ : ﴿ لَا تَتَّخِذُواْ إِلَهَيْنِ ٱثْنَيْنِ ﴾ ـــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ لَا تَتَّخِذُواْ إِلَهَيْنِ ثْنَيْنِ ﴾ .

ٱثْنَتَانِ:﴿ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ ثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً ﴾ .

ٱثْنَتَيْنِ : ﴿ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ ﴾ ـــ دەخوێنرێتەوە بە ـــ ﴿ فَإِن كَانَتَ ثْنَتَيْنِ ﴾ .

ج ـ همزة الوصل لە فعل

دەچێتە سەر فعل و لەکاتی دەست پێکردن بەم فعلانە بە کسرة دەست پیٚ دکەین .

وەکو : ﴿ ٱضرب ، ٱستَغفَار ، ٱنتَصَر ﴾ .

جگە ئەمانەی سەرەوە کە باسمان کرد هەمووی هەمزەی ( قطع ) ـە .

وەکو : ﴿ أحمد ، إلياس ، إسماعيل ﴾ .

## حركات همزة الوصل

أ . همزة الوصل دەبێت بە فتحة لە ( أل التعريف )ی سەرەتا ( ابتداء ) :

نموونە : ﴿ ألرَّحْمَنِ ، ألْقُرْآنَ ، ألرَّحِيمِ ﴾ .

ب . همزة الوصل دەبێت بە ضمة کاتێك سێيەم پيتی فعلەکە ضمة بێت .

نموونە : ﴿ ٱخْرُجْ ، ٱدْخُلُواْ ، ٱضْطُرَّ ﴾ .

جگە لەم چوار پيتە هەر چەندە سێيەم پيتيان ضمةيە بەڵام بە کسرة دەخوێنرێتەوە ، کە ئەمانەن : ﴿ ٱمْشُوا ، ٱبْنُوا ، ٱمْضُواْ ، ٱقْضُواْ ﴾ .

ج . جگە لە دوو حاڵەتەکەی پێشوو هەمووی دەبێت بە کسرة .

نموونە : ﴿ ٱقْرَأْ ، ٱخْتَلَفَ ، ٱقْتَتَلَ ﴾ .

## حەرەکە دانان بۆ پیتێکی ساکن ئەگەر لە پێشی ( همزة ) ی وصل بێت

کاتێك همزة الوصل لە دوای پیتێکی ساکن هات ئەوا سیٚ حاڵەتی هەیە کە فتحة یان ضمة یان کسرة دەبێت .

أ . کاتێك ( مِنْ ) پێشی همزة الوصل هات ئەوا نونی ( مِنْ ) مکە دەبێتە فتحة .

**نموونە :** ﴿ فَمِنَ اللّهِ ، مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴾ .

ب . ( الـواو ، الميم ) ی جـەمـاعـەی ساکن دەبێتە ضمـة کاتێك همـزة الـوصل لـــە دوای هـات .

**نموونە :** ﴿ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ ، إِلَيْكُمُ السَّلَمَ ، وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ ﴾ .

ج . پێشی همزة الوصل دەبێتە کسرة جگە لە دوو حاڵەتەکەی پێشوو .

**نموونە :** ﴿ أَنِ اضْرِب ، وَقَالَتِ اخْرُجْ ، أَنِ امْشُوا ﴾ .

د . ئەگەر تەنوین پێش همزة الوصل هات ئەوا نونی تەنوینەکە دەبێت بە کسرة .

**نموونە :**

﴿ مَحْظُورًا ( ) انْظُرْ ﴾ ــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ مَحْظُورنِ نْظُرْ ﴾ .
﴿ مِنْ رِجْزٍ أَلِيمٌ ( ) اللَّهُ ﴾ ــ دەخوێنرێتەوە بە ــ ﴿ مِنْ رِجْزٍ أَلِيمُنِ اللَّهُ ﴾ .
﴿ وَعَذَابٍ ( ) ارْكُضْ ﴾ ــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ وَعَذَابِنِرْكُضْ ﴾ .
﴿ أَحَدٌ ( ) اللَّهُ ﴾ ــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ أَحَدُنِ اللَّهُ ﴾ .

## چەند ئاگادارکردنەوەیەکی گرنگ دەربارەی خوێندنەوە

### ئاگادارکردنەوەی یەکەم :

﴿ وَيَبْصُطُ ﴾ ( سـورة البقرة : ٢٤٥ ) ، ﴿ بَصْطَةً ﴾ ( سـورة الأعراف : ٦٩ ) : بـە ( ص ) دەنوسرێت بەڵام بە ( س ) دەخوێنرێتەوە .

﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾

﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾

﴿ يَقْبِضُ وَيَبْصُطُ ﴾ ــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ يَبسط ﴾ .
﴿ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَصْطَةً ﴾ ــ دەخوێنرێتەوە بە ــــــ ﴿ بَسْطَةً ﴾ .

﴿ الْمُصَيْطِرُونَ ﴾ ( سورة الطور : ٣٧ ) : بە ( ص ) دەنوسرێت وە بـە ( س ) ، و بە ( ص ) یش دەخوێنرێتەوە ، چونکە ( س ) لە ژێر ( ص ) ـەکە نوسراوە .

﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۣيْطِرُونَ ﴾

﴿ الْمُصَيْطِرُونَ ﴾ ــــ دەخوێنرێتەوە بە ــــ ﴿ الْمُسَيْطِرُونَ ، الْمُصَيْطِرُونَ ﴾ .

﴿ بِمُصَيْطِرٍ ﴾ ( سورة الغاشية : ٢٢ ) :

﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴾ بە ( ص ) دەنوسرێت وە بە ( ص ) دەخوێنرێتەوە .

### ئاگادارکردنەوەی دووەم :

دەتوانین ووشەی ( ضَعْف ) بە ضمة یان بە فتحة بخوێنرێتەوە ، وە فتحة لە پێشترە لە خوێندنەوەدا ... ﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ ضَعْفٍ ( ضُعْفٍ ) ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ ضَعْفٍ (ضُعْفٍ ) قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا ( ضُعْفًا ) وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ ﴾ ( سورة الروم : ٥٤ ) .

## ئاگادارکردنەوەی سێیەم :

وەستان لــە ســەر ووشەی ﴿ آتَانِيَ ﴾ لــە ﴿ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ ﴾ دەتــوانین بلێین : ﴿ فَمَا آتَانِي ﴾ هــەروەهــا ﴿ فَمَا آتَانْ ﴾ ، و لــەکاتی وصل دا ( الياء ) مفتوحە ﴿ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ ﴾

﴿ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَـٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ﴾ ( سورة النمل : ٣٦ ) .

### ❑ الإمالة :

واتە لارکردنەوە دەربڕین ( لفظ ) ێکە لە نێوان الإلف و الياء ، و تەنها لە یەك ووشە هەیە لە قورئان لە ( سورة هود : ٤١ ) دا ، و لە ووشەی ﴿ مَجْرَاهَا ﴾ .

﴿ وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾

### ❑ التسهيل :

دەربڕین ( لفظ ) ێکە لــە نێوان همزة و حرکە ، و تەنها لە یەك ووشە لە قورئاندا هەیە لە ( سورة فصلت : ٤٤ ) دا ، و لە ووشەی ﴿ ءاعْجَمِيٌّ ﴾ .

﴿ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّٗا لَّقَالُواْ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ءَا۬عۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٞ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴾.

## ئاگادارکردنەوەی چوارەم :

لە ( سورة الحجرات : ١١ ) دا لە ئایەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ لەکاتی وصل همزة الوصل نامێنێت ( لام ) ـەکەش دەبێتە کسرة .

﴿ بِئْسَ ٱلاسم ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــ ﴿ بئسَ لِسمُ الفُسُوق ﴾ .

لـــە کاتی دەست پێکردن بەم شێوەیە دەبێت : ﴿ أَلِسْمُ الفُسُوق ﴾ یان ﴿ لِسمُ الفُسُوق ﴾ .

## لەحن و جۆرەکانی

**هەڵەکردن ( اللحن ) :** واتە هەڵەکردن لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا ، ئەمیش دوو جۆرە :

١ . اللحن الجلي .

٢ . اللحن الخفي .

### ١ ـ هەڵەکردنی ئاشکرا ( اللحن الجلي ) :

ئەو هەڵەکردنەیە لە کاتی خوێندنی قورئاندا ، کە هەموو کەسێك پێی دەزانێت ئەوەی کە شارەزا بێت یان شارەزا نەبێت لە قورئاندا ، وەکو گۆڕینی پیتێك بە پیتێکی تر وەکو ( ط ) بگۆڕێت بە ( ت ) یان گۆڕینی حرکە ( فتحة ) بگۆڕێت بە ( كسرة ) ، ئەم جۆرە هەڵەکردنە حەرامە .

### ٢ ـ هەڵەکردنی نادیار ( اللحن الخفي ) :

ئەو هەڵەکردنەیە لە کاتی خوێندنی قورئاندا ، تەنها ئەو کەسانە هەستی پێ دەکەن کە شارەزان لە خوێندنەوەی قورئان وەکو جێ بەجێ نەکردنی مینگە ( غنة ) یان کەمکردنەوەی مەدد یان زۆر درێژکردنەوەی مەدد کە دوو چرکە ( حرکة ) بێت بکرێتە چوار چرکە ( حرکة ) ، ئەم جۆرەیان مەکروهە .

## وەستان و بەشەکانی

وەستان ( الوقف ) : وەستان بریتیە لە پچڕاندن و وەستان لەسەر کۆتایی ووشەیەك ، بۆ ئەوەی هەناسە وەربگرێ و نیازی دەسپێکردنەوەی هەبێت .

وەستان ( وقف ) دەبێتە دووبەشی سەرەکی :

یەکەم : وەستانی ناچاری ( الوقف الإضطراري ) .

دووەم : وەستانی ئارەزوو ( الوقف الإختياري ) .

### یەکەم : وەستانی ناچاری ( الوقف الإضطراري ) :

بریتییە لە وەستان لەسەر ووشەیەك بەناچاری بەهۆی تەواوبوونی هەناسەوە ، یا تەنگە نەفەسیەوە ، یا بەهۆی پژمەوە ، یا هەر شتێکی تر لەو بابەتانە .

❑ وەستان لەسەر ( تاء التأنيث ) :

ئەگەر لەڕەسمی ( مصحف )دا بەتای کراوە ( تاء التأنيث مبسوطة ) نوسرا بوو ئەوا بە ( تاء ) دەوەستین :

﴿ رَحْمَتَ اللّه ﴾ ـــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ رَحْمَتْ ﴾ .

جگە لە ﴿ وَرَحْمَةٌ ﴾ دەبێت بە ﴿ وَرَحْمَه ﴾.

﴿ سُنَّتَ اللَّه ﴾ ـــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ سُنَّتْ ﴾ .

جگە لە ﴿ سُنَّةُ ﴾ دەبێت بە ﴿ سُنَّه ﴾ .

﴿ نِعْمَتَ اللّه ﴾ ـــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ نِعْمَتْ ﴾ .

جگە لە ﴿ نِعْمَةَ ﴾ دەبێت بە ﴿ نِعْمَه ﴾ .

﴿ مَعْصِيَتِ الرَّسُول ﴾ ـــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــ ﴿ مَعْصِيَتْ ﴾ .

جگە لە ﴿ مَعْصِيَةَ ﴾ دەبێت بە ﴿ مَعْصِيَه ﴾

﴿ كَلِمَتُ رَبِّكَ ﴾ ـــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ كَلِمَتْ ﴾ .

جگە لە ﴿ كَلِمَةَ ﴾ دەبێت بە ﴿ كَلِمَه ﴾ .

﴿ بَقِيَّتُ الرَّسُول ﴾ ـــــــــــ دەخوێنرێتەوە بە ـــــــــــ ﴿ بَقِيَّتْ ﴾ .

جگە لە ﴿ بَقِيَّة ﴾ دەبێت بە ﴿ بَقِيَّه ﴾ .

**دووەم : وەستانی ئارەزوو ( الوقف الإختياري ) :**

بريتييە لە وەستان بەپێی ویست و ئارەزووی خوێنەر ، و دەبێتە دوو بەش :

**أ . جائز .** **ب . ممنوع .**

**أ ـ وەستانی ڕێپێدراو ( الوقف الجائز ) :**

وەستانی ڕێپێدراو ( الوقف الجائز ) دەبێتە سێ بەشەوە ئەوانیش :

**١ . وەستانی تەواو ( الوقف التام ) .**

**٢ . وەستانی کافی .**

**٣ . وەستانی باش ( الوقف الحسن ) .**

**١ ـ وەستانی تەواو ( الوقف التام ) :**

وەستانە لەسەر ووشەیەك کە مانای تەواو بێت و هیچ پەیوەندی نەبێ بەوەی بەدوایدا دێت نەلەڕووی مانا و نە لەڕووی ( إعراب ) ـەوە . وەکو وەستان لەسەر کۆتایی سورەتەکان یا کۆتایی چیرۆکەکان یا کۆتایی سیفاتی ئیمانداران یا بێباوەڕان یا تەواوبوونی باسی بەهەشت یان دۆزەخ ... هتد .

**٢ ـ وەستانی کافی :**

وەستانە لەسەر ووشەیەك تەنها لەڕووی ( إعراب ) ـەوە پەیوەندی هەیە بەوەی بەدوایدا دێت .

**٣ ـ وەستانی باش ( الوقف الحسن ) :**

وەستانە لەسەر ووشەیەك مانای تەواو بێت بەڵام لە ڕووی مانا و ( إعراب ) ـەوە پەیوەندی هەیە بەوەی بەدوایدا دێت ، دەبێت لە کاتی دەست پێکردنەوە بگەڕێنەوە بۆ چەند ووشەیەك کە مانای بێت .

## ب ـ وەستانی ڕێپێنەدراو ( الوقف الممنوع ) :

وەستانی ڕێپێنەدراو ( الوقف الممنوع ) دەبێتە دوو بەش ئەوانیش :

١ ـ وەستانی ناشرین ( الوقف القبیح ) .

٢ ـ وەستانی زۆر ناشرین ( الوقف الأقبح من القبیح ) .

### ١ ـ وەستانی ناشرین ( الوقف القبیح ) :

ئـــەو وەستانە ( وقف ) یە کە مانا نابەخشێت وەکو وەستان لەسەر ( مبتدأ ) بەبێ ( خبر ) یان ( فعل ) بەبێ ( فاعل ) .

**نموونە :**

وەستان لەسەر ﴿ قالَ ﴾ بە تەنها لە ﴿ قالَ الله ﴾ .

وەستان لەسەر ﴿ مُحَمَّد ﴾ بە تەنها لەسەر ﴿ مُحَمَّدُ الرَّسُولُ الله ﴾ .

وەستان لەسەر ﴿ كَانَ ﴾ بە تەنها لە ﴿ وكَانَ اللّهُ ﴾ .

وەستان لەسەر ﴿ يَفْعَلْ ﴾ بەتەتها لە ﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴾ .

### ٢ ـ وەستانی زۆر ناشرین ( الوقف الأقبح من القبیح ) :

ئەو وەستانەیە کە پێچەوانەی مەبەستی خوایە ، حەرامە ئەگەر ناچاری نەبێت .

**نموونە :**

وەستان لەسەر ﴿ يَسْتَحْيِي ﴾ لە ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَن يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا ﴾ .

وەستان لەسەر ﴿ الصَّلاَةَ ﴾ لە ﴿ يَـا أَيُّهَا الَّــذِينَ آمَنُــواْ لاَ تَقْرَبُــواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَرَى ﴾ .

وەستان لەسەر ﴿ الظَّالِمِينَ ﴾ لە ﴿ يُدْخِلُ مَن يَشَاء فِي رَحْمَتِهِ وَالظَّالِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾

**تێبینی :** دەتوانین بوەستین لـە کۆتـایی ئایـەت هـەر چـەندە پێویـستی بـە مانا هـەبێت لـە دوای خۆیەوە .

وەکو : وەستان لەسەر ﴿ فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ ( ) الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾ .

وەستان لەسەر ﴿ أَلَا إِنَّهُمْ مِنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ( ) وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾ .

## نیشانەکانی وەستان :

م: نیشانەی وەستانی پێویستە .

لا: نیشانەی وەستانی قەدەغەیە .

صلى : نیشانەی وەستانی ڕێپێدراوە ، بەڵام بەردەوام بوون ( وصل ) لە پێشترە .

قلى : نیشانەی وەستانی ڕێپێدراوە ، بەڵام وەستان ( وقف ) لە پێشترە .

ج : نیشانەی وەستانی ڕێپێدراوە ( وەستان و بەردەوام بوون وەکو یەکن ) .

∴ ∴ : ئەگەر لەسەر یەکێك لەم دوو نیشانە بوەستی لەسەر ئەوی تر ناوەستی وە دەتوانین لەسەر هیچ کامیان نەوەستین .

## دەستپێکردن و بەشەکانی

دوو جۆر دەستپێکردن ( الإبتداء ) هەیە ئەوانیش :

أ ـ جائز .          ب ـ ممنوع .

### أ ـ دەستپێکردنی ڕێپێدراو ( الإبتداء الجائز ) :

دەستپێکردنی ڕێپێدراو ( الإبتداء الجائز ) دوو جۆرە :

١ ـ دەستپێکردنی تەواو ( الإبتداء التام ) .

٢ ـ دەستپێکردنی کافی .

### ١ ـ دەستپێکردنی تەواو ( الإبتداء التام ) :

ئەو دەستپێکردنەیە کە هیچ پەیوەندی بە پێشی خۆی نیە نە لەڕووی مانا و نەش لە ڕووی ( إعراب ) ـەوە ، وەکو :

﴿ الم ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ ﴾ .

﴿ الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ ﴾ .

﴿ وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ .

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ ﴾ .

### ٢ ـ دەستپێکردنی کافی :

ئـەو دەستپێکردنەیە کە لە مانا پەیوەندی بەپێشی خۆی هـەیە بـەڵام لـە ڕووی ( إعراب ) ـەوە پەیوەندی پێوە نیە وەکو :

﴿ أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ ﴾ .

﴿ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا ﴾ .

### ب ـ دەستپێکردنی قەدەغەکراو ( الإبتداء الممنوع ) :

دەستپێکردنی قەدەغەکراو ( الإبتداء الممنوع ) دەبێتە دوو بەش :

١ . قبيح .　　　　٢ . أقبح من القبيح .

### ١ ـ دەستپێکردنی ناشرین ( الإبتداء القبيح ) :

ئەو دەستپێکردنەیە کەمانا نابەخشێت وەکو دەستپێکردنی فاعل بەبێ فعل :

**نموونە :** دەستپێکردنی ﴿ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ ﴾ لە ﴿ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ ﴾ .

دەستپێکردنی ﴿ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ﴾ لە ﴿ أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ﴾ .

### ٢ ـ دەستپێکردنی زۆر ناشرین ( الإبتداء الأقبح من القبيح ) :

ئەو دەستپێکردنەیە کە ماناکەی دەگۆڕێت وە پێچەوانەی مەبەستی خوایە .

نموونە : دەستپێکردنی ﴿ اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا ﴾ لە ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا ﴾ .

دەستپێکردنی ﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ﴾ لـە ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَآلُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾ .

**تێبینی :** دەتوانین لە سەرەتای ئایەت دەست پێبکەین هەر چەندە ماناکەشی تەواو نەبێت و پێویستی بە پێشی خۆی هەبێت .

**وەکو :** ﴿ الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾ .

## السكت

( **السكت** ) : واتە وەستان لە کاتی خوێندنەوە بەبێ هەناسەدان بەگوێرەی دوو چرکە ( حرکة ).

لە چوار شوێندا واجبە ئەوانیش :

١ . لە نێوان ﴿ عِوجًا﴾ و ﴿ قَيِّمًا ﴾ لە ( سورة الكهف : ١ ، ٢ ) .

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ۝١ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴾ .

٢ . لە نێوان ﴿مَرْقَدِنا ﴾ و ﴿ هَذا ﴾ لە ( سورة يس : ٥٢ ) .

﴿ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ .

٣ . لە نێوان ﴿ مَنْ ﴾ و ﴿ رَاقٍ ﴾ لە ( سورة القيامة : ٢٧ ) .

﴿ وَقِيلَ مَنْ ۜ رَاقٍ ﴾

٤ . لە نێوان ﴿ بَلْ ﴾ و ﴿ رَانَ ﴾ لە ( سورة المطففين : ١٤ ) .

﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾

وە لە دوو شوێندا جائزە ( **سکت** ) بکەین یان ( **سکت** ) نەکەین .

**یەکەم : لە نێوان سورەتی ( الأنفال ) و ( التوبة ) دا .**

﴿ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ( ) بَرَاءَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾ .

**دووەم : لە نێوان ووشەی ﴿ مَالِيَهْ ﴾ ﴿ هَلَكَ ﴾ لە ( سورە الحاقە : ٢٨ ، ٢٩ ) دا .**

**تێبینی :**

لە ( **عِوَجًا** ) کە کۆتایی ئایەتە ، ( **مَرْقَدِنَا** ) کە کۆتایی باسی کافرانە دەتوانین بوەستین ، لەبەر ئەوەی وەستانی تەواوە ( الوقف التام ) ، وە دەتوانین وصل بکەین بە ( **سکت** ) .

بەڵام ناتوانین لە ( **مَنْ راق** ) و ( **بَلْ ران** ) بوەستین ، و دەبێت وصل بکەین لەگەڵ ( **سکت** ) دا .

## الروم والإشمام والإسكان

ئەصل لە وەستان ( الإسكان ) ـە ، وە هەروەها دەتوانین ( الروم ) بکەین لە کسرة و ضمة وە (الإشمام ) بکەین لە ضمة ، بەڵام لە فتحة ( الروم والإشمام ) ناکرێت .

**یەکەم : الروم :**

١ ـ ئەوەیە کە دەوەستیت حرکەکە دەخوێنرێتەوە بە شێوەیەك نزیك دەبیسێت بەڵام دوور نەی بیسێت .

٢ . الروم تەنها لە کسرة و ضمة دەکرێت .

**( الروم ) سێ حاڵەتی هەیە کە ئەمانەن :**

١ . ( الروم ) دەکرێت لە ووشەیەك پێشی کۆتاییەکەی پیتی مەدد نەبێت .

**نموونە :** ﴿ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴾ ﴿ وَالْفَجْرِ ﴾ .

٢ . ( الروم ) دەکرێت پێش کۆتاییەکەی مەددی طبیعی بێت .

**نموونە :** ﴿ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ﴿ نَسْتَعِينُ ﴾ .

٣ . ( الروم ) دەکرێت لە ووشەیەك پێش کۆتاییەکەی مد متصل بێت ، لەگەڵ درێژکردنەوەی مەدد کە چوار یان پێنج چرکە ( حرك ) یە :

**نموونە :** ﴿ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ ﴾ ﴿ لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴾ .

**دووەم : الإشمام :**

١ . هەر دوو لێو دەجوڵێنین بەبێ دەنگ وەکو ( ضمة )یەکی سڕاوە لە دوای وەستان بە سکون.

٢ . ( الإشمام ) تەنها لە ضمة دەکرێت .

**( الإشمام ) سێ حاڵەتی هەیە کە ئەمانەن :**

١ . ( الإشمام ) لە ووشەیەك پێش کۆتاییەکەی پیتی مەدد نەبێت .

**نموونە :** ﴿ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرُّ ﴾ ، ﴿ فِيهِ مُزْدَجَرُ ﴾ .

٢ . ( الإشمام ) دەکرێت لە تووش هاتوو بە زننە ( العارض للسكون ) .

**نموونە :** ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمُ ﴾ ، ﴿ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودُ ﴾ .

٣ . ( الإشمام ) دەکرێت کە پێش کۆتاییەکەی مد عاض متصل بێت ، لەگەڵ درێژکردنەوەی مەدد کە چوار یان پێنج چرکە ( حرك ) یە : **نموونە :** ﴿ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ ﴾ .

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وصَلَى اللهُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّد، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّم.